پرۆژەی ( Ramaleen )

ڕامالینی شلڕەوێتی ( ٤ )

# مەدخەلیەت !

## ناو و ناتۆرەنانە لە سەلەفییەکان

## نـەك

## ڕەوتێکی هاوچەرخ !!

وەڵامێك بۆ

چەواشەکاری شلڕەوێکی نەزان

لە هەوڵی نەزۆکی بۆ لێدانی سەلەفیەت بە ناوی مەدخەلیەتەوە

کە پیشەی بیدعەکارانە !!


باوکی سوننە

عدنان بارام کەلاری

پڕۆژەی ڕامالین

RAMALEEN

« ڕامالینی شلڕەوێتی : 4 »

## ( مەدخەلیەت ! ) ناوونا تۆڕەنانە لە سەلەفیەکان

# نەک ڕەوتێکی هاوچەرخ !!



**-پەرتووک : ( مەدخەلیەت ! ) ناوونازناوە نانە لە سەلەفیەکان**

# نەک ڕەوتێکی هاوچەرخ !!

**-ئامادەکار :** باوکی سوننە عدنان بارام کەلاری .

**-چاپی :** یەکەم .

**-ساڵی چاپ :** « ١٤٣٩ک-٢٠١٧ز» .

## پرۆژەی ڕامالین

## RAMALEEN

« ڕامالینی شلرەویتی : 4 »



# (مەدخەلیەت !) ناوو ناتۆرانە لە سەلەفیەکان

# نەک ڕەوتێکی هاوچەرخ !!

## وەلامێک بۆ چەواشەکاری شلۆڕەوێکی نەزان

لە هەوڵی نەزۆکی بۆلێدانی سەلەفیەت بەناوی مەدخەلیەتەوە ،

کە پیشەی بیدعەکارانە !!


باوکی سوننە

عدنان بن بارام کەلاری

## پێشەكی ئامادەكار

شوكر و ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو جیهانیان ، صەڵات و سەلامیش لەسەر پەیامبەری خۆشەویست و ئال وبەیت و هاوەڵان و شوێنكەوتوانیان بەچاكە تا ڕۆژی دوایی ... پاشان دەڵێم :

نارەواكاران ـ لە دێری زەمانەوە ـ هیچ ڕێگری لێ نەكردوون لەوەی كە جۆرەها ناو و ناتۆرەی ناقۆڵا بنەن بە ئەهلی هەقەوە ، ئەوەش بۆ دوورخستنەوە و سڵاندنەوەی خەڵك لە پەیڕە و بیروباوەی تەندروستیان ، هەموو ئەوەش بەهەندێك بڕوبیانووی پوچەڵ و بێ بنەوا و درۆ كە دروستیانكردوون و هەڵیان بەستوون دژ بە پێشینان ، تاكو گەشتۆتە ئەوەی كە ئەو ئاكار و سیفەتە ـ واتە : تانە و تەشەردان و داهێنانی ناو وناتۆرەی نارەوا بۆ ئەهلی هەق ـ ببێتە سیفەتێكی زەق و دیاری جیاكەرەوەی نارەواكان و بیدعەكاران .

پێشەوا ( ابن أبي حاتم ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( عَلَامَةُ أَهْلِ الْبِدَعِ : الْوَقِيْعَةُ فِي أَهْلِ الْأَثَرِ )) [1] ، واتە : نیشانەی بیدعەكاران : تانە و توانجدانە لە ئەهلی حەدیس و ئاسەواری پێشینان .

جا لەو ناو وناتۆرانەی كە لە كۆندا بە ئەهلی هەقیان ووتووە : (( الْـمُشَبِّهَةُ !! ، وَالْـحَشَوِيَّةُ !! ، وَالنَّاْصِبَةُ أَو النَّوَاْصِبُ !! ، وَ الْـمُجَسِّمَةُ !!! )) ... هتد !!! ، هەموو ئەمانەش نیشانەی تەواوی و كاملێتی ئەهلی هەقیان زیاتر دەرخستووە ، شاعیر دەڵێت :

وَإِذَاْ أَتَتْكَ مَذَمَّتِي مِنْ نَـاْقِصٍ ... فَهِيَ الشَّهَـاْدَةُ لِـي بِأَنِّي كَاْمِــلُ

پێشەوا ( أحمد بن حنبل ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ سەبارەت بە بیدعەكاران فەرموویەتی :

(( وقد أحدث أهل الأهواء والبدع والخلاف أسماء شنيعة قبيحة ، يسمون بها

---

[1] ( شرح أصول الاعتقاد ، للالكائي ، برقم : ٢٨٥ : ١ / ١٧٩ ) .

أهل السنة ، يريدون بذلك الطعن عليهم ، والإزراء بهم عند السفهاء والجهال )) [(١)] .

واتە : کەسانی ئارەزووپەرست و بیدعەکار و جیاوازکاران ناو و ناتۆرەی خراپ و ناشیا و ناقۆڵایان داهێناوە ، و ئەهلی سوننەیان پێ ناوزەدکردووە ، بەو کارەیان دەیانەوێت تانە وتەشەریان لێبدەن ، و ناشرینیان بکەن لەلای کاڵفام و نەزاناندا .

وە پێشەوا ( ابن القيم ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە ( النونية ) ـەکەیدا فەرموویەتی :

وَمِنَ الْعَجَائِبِ أَنَّهُمْ قَالُوا لِمَنْ ... قَدْ دَانَ بِالْآثَارِ وَالْقُرْآنِ

أَنْتُمْ بِذَاْ مِثْلُ الْخَوَاْرِجِ إِنَّهُمْ ... أَخَذُوا الظَّوَاْهِرَ مَا اهْتَدَوْا لِمَعَاْنِ

فَانْظُرْ إِلَى ذَلْ البَهْتِ هَذَا وَصْفُهُمْ ... نَسَبُوا إِلَيْهِ شِيْعَةُ الْإِيْمَاْنِ

سَلّوا عَلَى سُنَنِ الرَّسُولِ وَحِزْبِهِ ... سَيْفَيْنِ : سَيْفَ يَدٍ وَسَيْفَ لِسَاْنِ

وە لە جێگەیەکی تردا فەرموویەتی :

وَمِنَ الْعَجَاْئِبِ قَوْلُهُم لِمَن اقْتَدَى ... بِالْوَحْي مِنْ أَثَرٍ وَمِنْ قُرْآنِ

حَشَوِيَّةٌ يَعْنُونَ حَشْواً فِي الْوُجُودِ ... وَفَضْلَةً فِي أُمَّةِ الْإِنْسَاْنِ

كَمْ ذَاْ مُشَبِّهَةٍ مُجَسِّمَةٍ نَوَاْ ... بِتُهُ مَسَبَّةُ جَاْهِلٍ فَتَّاْنِ

أَسْمَاْءَ سَمَّيْتُم بِهَاْ أَهْلَ الْحَدِيْثِ ... وَنَاْصِرِيِّ الْقُرْآنِ وَالْإِيْمَاْنِ

سَمَّيْتُمُوهُمْ أَنْتُمُ وَشُيُوخُكُم ... بُهْتاً بِهَاْ مِنْ غَيْرِ مَاْ سُلْطَاْنِ

وَجَعَلْتُمُوهَاْ سَبَّةً لِتُنَفِّرُوا ... عَنْهُمْ كَفِعْلِ السَّاْحِرِ الشَّيْطَاْنِ

وە بەرهەڵستکارانی ئەهلی سوننە و جەماعە بەوە کۆتاییان نەهێنا لە کۆندا پێی هەستاوون ، بەڵکو بەردەوام بوون لە ناو و ناتۆرەنانیان لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا ، و هەموو جار ناو و ناتۆرەی نوێیان داهێناوە ، و هەموو ئەوەش بۆ کەم و کوڕی دانەپەڵ

---

[(١)] ( كتاب السنة للإمام أحمد : ص٤٠ ، وطبقات الحنابلة ، لابن أبي يعلى : ١ / ٣٣ ) .

ئەهلی هەق ، و ڕەتاندنەوەی خەڵك بووە لە پەیڕەو و بیروباوەڕ و بانگەوازی ڕەوایان !!!!

*ئەوەتا لەم سەردەمانەدا دەبیستین بە ئەهلی سوننە وسەلەفیەکان دەڵێن :*

✍ ( **وەهابیەکان !!!** ) کــە نیسبـــەتە بــۆ نـــاوی پێشەوا ( محمد ) ــی کـــوڕی ( عبدالوهاب ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ !!!!

✍ یان پێیان دەڵێن : ( **جامیەکان** !!! ) کە ئەمەشیان نیسبەتە بۆ زانای پایەبەرز ( محمد أمان الجامي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ !!!

✍ وە هەر لەو ناو ناتۆرانەش کە پێیان دەووترێت : ( **لاجماعە** !!! ) یە !!!

✍ دواترینیان ئەوەیە کە بە سەلەفیەکان دەڵێن : ( **مەدخەلیەکان !!!** ) وە ئەمشیان نیسبەتە بۆ شێخ ( ربيع بن هادي المدخلي ) ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ !!!!

ئەم کارەشیان زیندوکەرەوە و درێژەپێدانی کاری پێشینانیانە لەبەرامبەر ئەهلی سوننەدا ، و شوێنکەوتنێکە بۆ ( عبداللَّـه بن سبأ اليهودي !!! ) کە لە کاتی خۆیدا لە ئاشوبەکەی کوشتنی پێشەوا ( عثمان بن عفان ) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەیووت :

(( أَقِيْمُوا هَذَا الأَمْرَ بِالطَّعْنِ فِي عُلَمَـائِهِم ، وَأُمَرَائِهِم )) ، واتە : ئەم کارەتان سەربخەن و جێگیربکەن ، بە تانە و تەشەردان لە زانایان ، و پێشەوایانیان .

*بەڵام* : ئەوەی کە زۆر جێگەی داخە کەسانێك ـ لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا ـ بەناو سەلەفیەتەوە ئەو کارە ..... دەکەنەوە !!! ، و ڕەواجی پێدەدەن لەنێو تۆڕە کۆمەڵایەتیەکاندا !!! ، کە ئەمانەش لە هەموو خەڵکی زیاتر ترسناکترن ، و کاریگەری خراپیان لە زەمینەی واقعدا دەبێت ، و ئاگری فیتنە و ئاشوب خۆش دەکەن .

شێخ ( محمود شاكر ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لەبارەی ئەم جۆرە خەڵکەوە دەڵێت :

(( وَهَؤُلاءِ الأُخَر أَمْرُهُم أَخْطَرُ ؛ لِخَفَائِهِم ، وَتَسَتُّرِهِم بِالسَّلَفِيَّةِ وَالعُلَمَاءِ ، فَيَتَمَكَّنُونَ مِن التَّوَغُّلِ بَيْنَ السَّلَفِيِّيْنَ ، وَ إِثَارَةِ الفِتَنِ بَيْنَهُم ، وَمَنْشَأُ كَثِيْرٍ مِنَ الْفِتَنِ مِنْ هَذَا الصِّنْفِ !!! )) ، واتە : ئەو كۆمەڵانەی تر كار و كردەوەیان ترسناكترە ، لەبەر شاراوەیی و خۆ پۆشینیان بەناوی سەلەفیەت و زانایانەوە ، بۆیە دەتوانن بچنە ناو ڕیزی سەلەفیەكانەوە ، و ئاشوبیان لە نێواندا بنەنەوە ، سەرچاوە و سەرهەڵدانی زۆرێك لە فیتنە و ئاشووبەكان لەم چین و كۆمەڵەوەیە .

*دەڵێم* : پۆستێك كە دەشێت بكرێت بە نموونەی ئەم باسە ، و لەم ڕۆژانەدا نوسراوە و بڵاوكراوەتەوە ، پۆستە چەواشەكاریە شلۆەویەكەی ( *چالاك حسن* ) ـە كە هەوڵێكی نەزۆكە بۆ لێدانی بنەواكانی سەلەفیەت بەناوی مەدخەلیەتەوە !!! و ناونیشانەكەشی بەم شێوەیەیە : (( *مەدخەلیەت ، ڕەوتێكی سونی سەلەفیە* ، ... )) !!!

دەمەوێت لەم پێشەكیە ئەوە بیری موسڵمانان بخەمەوە كە كاری لەم جۆرەیان لەلا نامۆ نەبێت ، چونكە ئەمانە هەموو پشت ڕاستكەرەوە و ئاشكراكاری ئەو ووتەیەی پێغەمبەری خوایە ﷺ كە بە صەحیحی پێمان گەیشتووە فەرموویەتی :

« سَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ سَنَوَاتٌ خَدَّاعَاتٌ ، يُصَدَّقُ فِيهَا الْكَاذِبُ ، وَيُكَذَّبُ فِيهَا الصَّادِقُ ، وَيُؤْتَمَنُ فِيهَا الْخَائِنُ ، وَيُخَوَّنُ فِيهَا الْأَمِينُ ، وَيَنْطِقُ فِيهَا الرُّوَيْبِضَةُ » .

قِيلَ : وَمَا الرُّوَيْبِضَةُ ؟ قَالَ : « الرَّجُلُ التَّافِهُ فِي أَمْرِ الْعَامَّةِ » [(١)] .

واتە : ساڵانێكی هەڵخەڵەتێنەر بەسەر خەڵكدا دێت ، درۆزنی تێدا بەڕاست دادەنرێت ، و ڕاستگۆش تێیدا بەدرۆزن ، خیانەتكاری تێدا بەدەست پاك دادەنرێت ، و

---

(١) ( صحَّحه العلامة الألباني في الصحيحة ، برقم : ١٨٨٧ ، ورقم : ٢٢٥٣ ) .

دەست پاکیش بە خیانەتکار ، و تێیدا ڕوەیبیزەکان دێنەگۆ و دەدوێن .

ووترا : ڕوەیبیزە چیە ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ؟ ئەویش فەرمووی : کەسانی سوك و بێنرخ لە کاروباری گشتیدا .

بێگومان ڕۆژگاری ئەمڕۆیە کە ئەم ڕاستیەی تێدا بەدیهاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەتی هەواڵی پێداوین ، و ئەو جۆرە کەسانە دەرکەوتوون ، و لە هەموو بوارەکانی ژیاندا هەن ، بەتایبەت ئەوانەی ڕۆڵیان *لەسەر ئەنتەرنێتە* .

ئەوەتا چەندەها نووسەر و بێژەر دەرکەوتوون لە زانستە شەرعیەکاندا دەنوسن و دەدوێن : لە ماڵپەڕ و پەیجەکانیاندا ، لە :

(( whatsapp ، Twitter ، Telegram ، facebook )) ... هتد .

وە دەبینین ماڵپەڕ و پەیجی ئەم ***ڕوەیبیزانەی سەر ئەنتەرنێت*** بۆتە مینبەرێك کە ئاشوب و نەزانی لێیانەوە پەخش دەکرێت !!! و چەندەها شێوە و وێنەی خۆلێبوونە عالمی لێوە بلاو دەبێتەوە ، و زیان لە دین و ژینی موسڵمانان دەدەن !!!

لەبەر ئەمەیە کە هەر زانا و بیرمەند و هۆشیار و فێرخوازێکی زانستی شەرعی هەموو ئەوانە ببینێت دەزانێت کە ئەمە هاتنەدی و ڕوودانی ئەو فەرمایشتەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەیەوە فەرموویەتی ، لەگەڵ ئەوەش کە هەواڵی داوە کە قەڵەم بەدەست و نووسین و نوسەران زیاد دەکەن لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی ... کە ئەوەش لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی خۆشەویست و سەروەرمانە ﷺ .

***ئەو جۆرە کەسانە چەندەها سیفەتی نەفیان هەیە ، لەوانەش :***

***یەکەم :*** جەهلی مورەککەب ، و خۆ لێبووە زانا ، و لاف و گەزاف لێدانی چەندەها زانست کە تەنانەت هەر بنەوا و سەرەتاکانیشی نازانن ، لەگەڵ سەرسام بەخۆبوون کە پاڵنەریانە لەسەر بەردەوام بوون لە نەزانینەکانیان ، وە زۆرینەیان پووچ و بەتاڵن لە زانستی شەرعی ، وە زۆرێکیان حەزی خۆدەرخستنیان هەیە ( حب الظهور !! ) بۆیە

دەبینیت ناونیشانی زەق دادەنێن بۆ سەرنج ڕاکێشانی کەسانی تر .

**دووەم :** ووتن و فەتوادان بە ناو خوای پەروەردگار و شەریعەتەوە بەبێ هیچ خۆپارێزی و وەرەعێك ، بەڵکو هەموو فەتواکانیان بە نەزانین و شوێنکەوتنی ئارەزووەکانیانە ، ئەمە نەك لە پرس و باسە ئاساییەکان کە زۆرێك لە موسڵمانان دەیانزانن ، بەڵکو لە پرس و باس گەلێك کە لە پێشتر نەبوون !!! کە لە ڕاستیدا جگە لە زانایانی بەتوانا و پسپۆڕانی ئەم بوارە نەبێت ، کەسانی هاوشێوەی ئەم *ڕوەیبیزانەی سەرئەنتەرنێت* ناتوانن لێی بدوێن !!! کەچی ئەم *ڕوەیبیزانە* بە پۆشینیان بۆ پۆشاکی زانایان و خۆدەرخستنیان لەپۆشاکی ئەواندا هەڵدەستن بەبڵاوکردنەوەی نەزانی و ژەهرەکانیان بۆ خۆشکردنی بڵێسەی ئاشووب و ئاگری فیتنە لە نێوان موسڵماناندا !!!

**سێیەم :** کەودەنێتی و ڕووکەشی و هەرزەیی لە چارەسەرکردنی پرس و باسەکاندا !!!

ئەم خاڵانە و چەندەهای تر بەرچاو دەکەوون ئەگەر بڕوانرێتە : ووتار و نوسین و پۆست و کۆمێنت ... هتد ، و بەرهەمەکانی ئەم *ڕوەیبیزانەی سەرئەنتەرنێت* !!! مەرجیش نیە هەموو ئەمانە لە کەسێکدا کۆببنەوە ، بەڵکو هەر یەکەیان و هەندێك لەم خاڵانەی تێدایە ... و پشکیان تێیدا جیاوازە لە بوون و نەبووندا .

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ـ هەروەك ئاماژەمان پێدا ـ هەندێك لەوانەی بە زمان لاف وگەزافی ئەوە لێدەدەن کە گوایا ئەوان شوێنکەوتەی پەیڕەوی سەلەفی صالحن !!! یان بەخۆیان دەڵێن : ئێمە سەلەفین !!! ، و هەندێکیان ووتەی هەندێك زانای بەڕێزی سەلەفی بەکاردەهێنن !!! ، و لاف و گەزافی پیادەکردنی پەیڕەوی هەندێك لەو زانا بەڕێزانە دەدەن !!! ، کە لەڕاستیدا ئەو جۆرە کەسانە خۆیان پێیانەوە هەڵواسیوە ، و ئەو زانا بەڕێزانە بەرین لە پەیڕە و کردا و گوفتاری ئەو جۆرە کەسانە !!!

*جا خوێنەری بەڕێز بزانە کە* : ئەم نوسینەی بەردەستت چەند هەڵوێستەیەکە ـ گشتی یان تایبەتە ـ لەسەر پۆستێك لەپۆستەکانی (*چالاك حسن*) ، و هەندێك لەکۆمێنتەکانی

کە لە وڵامدانەوەی کۆمێنتنووسەکانی سەر پۆستەکەی نوسیویەتی ... .

*ئەوەشم لەیاد نەچێت کە* : لەم پێشەکیەدا شوکر و سوپاسگوزاری خۆم ئاراستەی برای بەڕێز و خۆشەویستم (*مامۆستا سۆران ڕەفیق*) بکەم کە ئەرکی پێداچوونەوەی ئەم نووسینەی گرتە ئەستۆ ، و بە هەڵەچنی و ڕاستکردنەوە و ئامۆژگاریەکانی نووسینەکەی پڕ پێزتر و باشترکرد ... دواکارم لە پەروەردگار پاداشتی بەخێری هەوڵ و ماندوبوونەکانی بداتەوە .

وە داواکاریشم لەپەروەردگاری بەبەزەیی ومیهرەبانم لەهەڵوێستەکانمدا پێکانی ڕەوایی وڕاستیم پێکەرەم کات ، وبەسەرخستنێکی وەربگرێت لەهەڵگرانی ئاینەکەی کە میراتگری ڕاستەقەینەی پێغەمبەرەکەین ﷺ ... ، وە بە تێکۆشانی دابنێت لە پێناو هەڵگرانی هەق و ڕاستی کۆمەڵەی ڕزگاربوو و سەرخراوادا .إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى. ... .

و پاداشتەکەشی لە ڕۆژێکدا بێت کە خۆی سەبارەتی فەرموویەتی : ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ * إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴾ ( الشعراء : ٨٨ ـ ٨٩ ) .

وە دوا ووتەشم ئەوەیە کە دەڵێم : ﴿ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ ( هود : ٨٨ ) .

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

*باوکی سوننە عدنان بارام کەلاری*

*کەلار ـ کوردستان*

# چەند هەڵوێستەیەكی گشتی

# لەسەر ڕیۆستەكەی (چالاك حسن)

❑ **پێشینە فەرموویانە : « وَالْفَضْلُ مَاْ شَهِدَتْ بِهِ الأَعْدَاْءُ » ... بەڵام !!!**

❑ **ناو وناتۆرەنان لەسەلەفیەكان كاری كۆنی بیدعەكارانە ، وجەنابتان تەنها ... دەكەیتەوە !!**

❑ **(*مەدخەلیەت !*) ناو و ناتۆرەنانە لە سەلەفیەكان ، نەك ڕەوتێكی هاوچەرخ !! وە ئەوەش كاری هاودەمانی جەنابتن : لەتەكفیری و ئیخوانچیە بیدعەكارەكان !!!**

❑ **( *كاكە مەلا !* ) ئایا دەزانیت : هیچ زانایەك ئەم بۆچوونە لار وگەوجەی جەنابتیان نەبووە بەرامبەر بە شێخ (رَبِيْع بْن هَاْدِي الْـمَدْخَلِي) ؟!، بەڵكو كارەكەتیان بە ... داناوە :**

❑ **ڕەتكردنی زانایان بۆ چەواشەكاریەكی (*چالاك حسن*) سەبارەت بە : « ئیلزام كردنی شێخ ڕەبیع بۆ بەرامبەرەكانی بە بۆچوون و ئیجتیهاداتەكانی خۆی » !!**

❑ **ئایا پەیڕەوی پێشەوایان ـ ئەلبانی و بن باز و عوسەیمین ـ رَحِمَهُمُ اللَّهُ ـ پێچەوانەی پەیڕەوی شێخ (رَبِيْع بْن هَاْدِي الْـمَدْخَلِي) ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ، وەك (*چالاك حسن*) ئیدیعای دەكات ؟!**

❑ **ووتە و هەڵوێستی كۆمەڵێك لە پێشەوایان و زانایان سەبارەت بە شێخ ( رَبِيْع بْن هَاْدِي الْـمَدْخَلِي ) ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ .**

# چەندهەڵوێستەیەکی گشتی
# لەسەر ڕێوستەکەی چالاک حسن

❑ **پێشینە فەرموویانە :** (( وَالْفَضْلُ مَاْ شَهِدَتْ بِهِ الأَعْدَاْءُ )) ... **بەڵام !!!**

( **چالاک حسن** ) دەڵێت : (( شێخ ربیع بن هادی المدخلی زانایەکی سونیە و خزمەتێکی زۆری بەم دینە کردوە )) .

**وە دەڵێت :** (( من هەر لەیەکەم ڕستەی نوسینەکەمدا وتومە شیخ ربیع عالمێکی سونی سەلەفیە ، وە وتومە خزمەتێکی زۆری بەم دینە کردوە ، وە وتومە ئەوەی ئەم جیا ئەکاتەوە لەو گەورە زانایانە دوای ئەوە دوو خاڵم باسکردووە ، واتە لە باقی مەسەلەکان وەکو ئەو زانایانەیە ... )) !!!

**دەڵێم :** ئەم شایەتیدانەی کە جەنابت باسی لێوە دەکەیت هیچ پێویستمان پێ نیە ، لە کاتێکدا کە دەیان زانای پایەبەرز و بەڕێز ـ وەکو : ئبن باز و ئەلبانی و ئبن عوسەیمین و وادعی و فۆزان و .... هتد ـ شایەتی ئەمە و لەمەش زیاتریان داوە بۆ ئەم شێخە بەڕێزە ، هەروەکو لەبەشەکانی ئەم نوسینەدا خراوەتەڕوو .

موتەنەببی لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت :

وَلَيْسَ يَصحُّ فِي الْأَذْهَـاْنِ شَـيْءٌ　　　إِذَا احْتَـاْجَ النَّهَـــاْرُ إِلَـى دَلِيْـلِ

**بەڵام ئەم کارەی جەنابت :** پیشەکی و چەشەیە بۆ قایلکردنی بەرامبەر بە چەواشەکاریەکانت ، و ئەو ژەهرەی کە دەتەوێت بەرامبەرەکەتی پێ سڕبکەیت !!! ئەمەش پیشەیەکە خوای پەروەردگار لە کار و کرداری هەندێك لە دروستکراوانێکی تری گێڕاویەتیەوە ، ئەویش لەو ئایەتانەی کە تێیاندا فەرموویەتی : ﴿ **فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ**

. . . وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ . . . فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ ﴾ ( الأعراف : ٢٠ ـ ٢٢ ) .

کەواتە گومڕاکاران بۆ قایلکردنی بەرامبەرەکەیان بە وەسوەسەکانیان ، جاری وا هەیە ـ شەیتان ئاسا ـ پێویستیان بە سوێندخواردن ـ یان وەسفکردن کەسانێك دەبێت کە هەر باوەڕییشیان پێنیە !!! ـ بەوەش دەتوانن ژەهری خۆیان بڕێژن ، و بگەن بەمەبەستەکانیان لە لێدانی بنەوا سەلەفیەکان !!!

*کەچی پاشان دێت ودەڵێت*: (( دەی بۆ ئەبێت دوای ئەم هەمو وەصف وسەنایە ، برای وا هەیە واتێبگەیێت من لە شأنی شیخ ربیعم کەمکردۆتەوە ؟!! ئایە ئەو برایانە هەر نایانەوێی باسی هەڵە و کەموکورتێکانی ئەو شێخە بکرێت ؟!! )) !!!

*دەڵێم* : نەخێر کار لەوەدا نیە کە باس لەوە بکرێت کە زانایانیش وەکو هەموو مرۆڤێکی تر شایەنی ئەوەن کە بکەونە هەڵەوە ، چونکە لە ئەبجەدیاتی سەلەفیەتە کە : (( كُلُّ بَنِي آدَم خَطَّاْءٌ .... )) زانایان بن یان جگە لەوان .

وە هەر لـە ئەبجەدیاتی سەلەفیەتە کە : (( كُلٌّ يُؤْخَذُ مِنْ قَوْلِهِ وَيُرَدُّ إِلَّا رَسُول اللَّـهِ ﷺ )) ، جا زانایان بن یان جگە لەوان .

بۆیە تانەکەی جەنابت ـ ئەگەرچی تۆ ئەهلی ئەوەش نیت کە ئەو هەڵسەنگاندنە بکەیت !!! ـ لەوەدا نیە کە بووترێت : شێخ ڕەبیعیش وەکو هەموو زانایەکی بەڕێزی تر ـ وەك مرۆڤ ـ ئەگەری کەوتنە هەڵەی هەیە ، چونکە ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە ، و ئەبجەدیاتی سەلەفیەتە ، *بەڵکو تانە و تەشەرەکەی جەنابت لەوەدایە کە* :

*یەکەم* : ناو و ناتۆرەی مەدخەلیەت بە سەلەفیەکانەوە دەنێیت !!!

*دووەم* : پاشان لەوەدایە کە دەڵێیت : مەدخەلیەت ڕەوتە !!!

*سێیەم* : دواتر لەوەدایە کە : جەنابت دەرگات لەسەر پشت کردۆتەوە بۆ هەرچی

مەوقوزە و موتەرەدیە و نەتیحە ... هتد ، كە تانە وتەشەر لەم شێخە بەڕێزە بدەن !!! ، هەروەكو لەبەشی تایبەتی ئەم پرس و باسەدا تانە و تەشەرەكان دەخرێنەڕوو .

**چوارەم** : تانەكەی جەنابت لەوەدایە كە : دەبێت ئەم شێخە بەڕێزە چ بیدعەیەكی كردبێت بۆ ئەوەی ڕەوت و كۆمەڵێكی بدەیتەپاڵ ؟!!!

چونكە ئەو ناو و ناتۆرانەی كە ئەهلی سوننە ناویانە بە بیدعەكارانەوە :

یان : وەصفە بۆ خودی بیدعەكە !!! یان : ناولێنانیەتی بە نیسبەت ئەو كەسەی كە دامەزرێنەرێتی و دایهێناوە و بڵاویكردووەتەوە !!!

بۆیە ئەم ناو وناتۆرەی جەنابت ـ كە ئێمە لەباسیداین ـ بەهیچ شێوەیەك دروست نیە بە هەر بڕ و بیانوویەك بێت ، چونكە ئەم زانا بەڕێزە هیچ بیدعەیەكی لە ئایینەكەی خوای پەروەردگاردا دانەهێناوە بۆ ئەوەی ڕەوتێكی بدرێتە پاڵ .

جا كە شێخ ( ربيع بن هادي المدخلي ) ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ وەكو جەنابت دەڵێیت :

زانایەكی (( سونیە ... )) !! ، یان : (( سونی سەلەفیە ... )) !!!!

كەواتە بۆچی هەر خۆت دێیت : بەڕەوتێكی سەلەفی لە قەڵەم دەدەیت !!! ، وە بەهۆكاری تەفریقەی دەزانیت ؟!!!

ئاخۆ دەكرێت كەسێكی تر ـ خۆت ئاسا ـ كە هەڵەیەك یان دووان ـ بەگومانی پوچی خۆی ـ لە ئوسلوب و شێوازی كاری زانایەك وەكو ئیبن باز یان ئەلبانی یان ئیبن عوسەیمین ... هتد ببینێت ، جا بێت و بڵێت : ڕەوتی بازیەكان !!! یان ڕەوتی ئەلبانیەكان !!! یان ڕەوتی عوسەیمینیەكان !!! ... هتد ؟!!!

یان ئەمەشیان ئیجتیهادێكی تری جەنابتانە كە ئەمە تەنها بەرامبەر شێخ ڕەبیع دروستە ، و بەرامبەر بەزاناكانی تر نابێت ، چونكە ئەو زانایانە دوورن لە هەڵە و كەم وكوڕی ، بەواتایەكی تر : مەعصومن !!!

یان حەقیقەتەكەی ئەوەیە كە جەنابت لە ووتەی ئەو زانایانەدا مەرام و مەبەستەكانی خۆتیان تێدا دەدۆزیتەوە و بەهۆی ووتەكانیانەوە چەواشەكاری شلۆەویەكانی

**خۆتی پێ ڕەواج پێدەدەیت ؟!!**

**نموونەی سەلمێنەری ڕاستی ئەمەش : پێشەی پێشووتە لەگەڵ ووتەکانی پێشەوا ئەلبانی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ :**

**کە دەتووت : ئیخوان موسلمین لە ئەهلی سوننە و فیرقەی ناجیەیە !!!!**

**یان : ئەوەی کە گوایا ئەو پێشەوایە نێوان بڕین و هەجرکردنی بیدعەکاران لەم سەردەمەدا بە هیچ شێوەیەك بە دروست نازانێت !!!!**

**یان : ئەوەی کە ئەو تێکەڵاویەی جەنابت لەگەڵ بیدعەکاران و حیزبی و لاڕێبواندا !!! لە ووتەکانی پێشەوا ئەلبانی ـ بەگۆمانی پوچی جەنابت ـ ڕێی دەبێتەوە و دروستە !!!**

**یان و دەیان یانی تریش کە ـ بە پشتیوانی خوای پەروەردگار ـ لە ڕۆژگارەکانی داهاتوودا ـ ئەگەر ناچارمان بکەیت ـ هەموویان ئاشکرا دەکەین ، و دەیانخەینە بەردەستی خوێنەران ، و موسڵمانی ئەهلی سوننە و جەماعە ، بۆ ئەوەی بزانن ئەمەی کە بەناو ئەوانەوە قسەدەکات : کێیە و چ بۆچوون و پەیڕەوێکی هەیە .**



❑ **ناو وناتۆرەنان لە سەلەفیەکان کاری کۆنی بیدعەکارانە. وجە نابتان تە نها ... دەکرێتەوە !!!**

**پێشەوا ( أحمد بن حنبل ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ سەبارەت بە ناو وناتۆرەنانی بیدعەکاران بە ئەهلی سوننە و جەماعەوە فەرموویەتی :**

**(( وقد أحدث أهل الأهواء والبدع والخلاف أسماء شنيعة قبيحة ، يسمون بها أهل السنة ، يريدون بذلك الطعن عليهم ، والإزراء بهم عند السفهاء والجهال ))** [١] .

**واتە : کەسانی ئارەزووپەرست و بیدعەکار و جیاوازکاران ناو و ناتۆرەی خراپ و ناشیا و ناقۆڵایان داهێناوە ، و ئەهلی سوننەیان پێ ناوزەدکردووە ، بەو کارەیان دەیانەوێت تانە وتەشەریان لێبدەن ، و ناشرینیان بکەن لەلای کاڵفام و نەزاناندا .**

**وە ( ابن أبـي حاتم الرازي ) لە باوکیەوە ـ رَحِمَهُمَا اللَّهُ تَعَالَى ـ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : (( بیستوومە باوکم دەیفەرموو : وعلامة أهل البدع : الوقيعة في أهل الأثر ؛ وعلامة الزنادقة** : تسميتهم أهل السنة حشوية يريدون إبطال الآثار !! ، **وعلامة الجهمية** : تسميتهم أهل السنة مشبهة !! **وعلامة القدرية** : تسميتهم أهل الأثر مجبرة !! **وعلامة المرجئة** : تسميتهم أهل السنة مخالفة وَنُقْصَانِيَّة !! **وعلامة الرافضة** : تسميتهم أهل السنة ناصبة !! ولا يلحق أهل السنة إلا اسم واحد ، ويستحيل أن تجمعهم هذه الأسماء )) [٢] .

**وە هەر لەم بارەیەوە پێشەوا ( أبو الفضل عباس بن منصور السكسكي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( وقد سمتها كل فرقة من فرق الضلال باسم غير موافق للحق ؛**

---

[١] ( كتاب السنة للإمام أحمد : ص٤٠ ، وطبقات الحنابلة ، لابن أبي يعلى : ١ / ٣٣ ) .

[٢] ( شرح أصول الاعتقاد للالكائي، حديث : ٢٨٥ ) .

حسداً منهم لها ؛ وافتراء عليها ، ونسبوها إلى غير ما تعتقده !!!

**فسمتها القدرية** : مجبرة !!! **وسمتها المرجئة** : الشكاكية !!! **وتسميها الرافضة** : ناصبة !!! **وتسميها الجهمية** : مشبهة !!! **وتسميها الأشعرية** : مجسمة !!! **وتسميها الغالية** : الحشوية !!! وتسميها الباطنية : مسودة !!!

**وتسميها المنصورية مرجئة** ؛ لقولها : إن تارك الصلاة إذا لم يكن جاحداً لوجوبها ، مسلم على صحيح المذهب !!

ويقولون : هذا يؤدي إلى أن الإيمان عندهم قول بلا عمل !!!

**وجميع ذلك غير صحيح في حقها ، بل هي الفرقة الناجية المهدية ، واعتقادها هو الاعتقاد الصحيح ، والإيمان صحيح ، الذي نزل به القرآن ، ووردت به السنة ، وأجمع عليه سلف الأمة من أهل السنة والجماعة ))** [1] .

**وە پێشەوا و شێخی پایەبەرز ( ابن القيم ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە هۆنراوەی ( النونية ) ـەکەیدا فەرموویەتی :**

وَمِنَ الْعَجَائِبِ قَوْلُهُم لِمَن اقْتَدَى ... بِالْوَحْي مِنْ أَثَرٍ وَمِنْ قُرْآنِ

حَشَوِيَّةٌ يَعْنُونَ حَشْواً فِي الْوُجُودِ ... وَفَضْلَةً فِي أُمَّةِ الْإِنْسَانِ

كَمْ ذَاْ مُشَبِّهَةٍ مُجَسِّمَةٍ نَوَاْ ... بِتُهُ مَسَبَّةُ جَاْهِلٍ فَنَّاْنِ

أَسْمَاْءَ سَمَّيْتُم بِهَاْ أَهْلَ الْحَدِيْثِ ... وَنَاْصِرِيِّ الْقُرْآنِ وَالْإِيْمَاْنِ

سَمَّيْتُمُوهُمْ أَنْتُمُ وَشُيُوخُكُم ... بُهْتاً بِهَاْ مِنْ غَيْرِ مَاْ سُلْطَاْنِ

وَجَعَلْتُمُوهَاْ سَبَّةً لِتُنَفِّرُوا ... عَنْهُمْ كَفِعْلِ السَّاْحِرِ الشَّيْطَاْنِ

---

[1] ( البرهان في معرفة عقائد أهل الأديان ، للسكسكي ، ص ٩٥ ـ ٩٦ ) .

**هەموو ئەم ووتانەش ئەوە دەسەلمێنن کە : ناو وناتۆرەنان لە سەلەفیەکان کاری کۆنی بیدعەکارانە ، و جەنابی (چالاک حسن) تەنها ... دەکاتەوە !!!**

**وە ئەو کارەشیان کۆتایی پێناهێنن کە لەکۆندا پێی هەستاوون ، بەڵکو بەردەوام دەبن لە ناو و ناتۆرەنانیان لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا ، و هەموو جار ناو و ناتۆرەی نوێ دادەهێنن ، و هەموو ئەوەش بۆ کەم و کۆڕی دانەپەڵ ئەهلی هەقە ، بۆ ڕەتاندنەوەی خەڵکە لە پەیڕەو و بیروباوەڕ و بانگەوازی ڕەوایان !!!!**



( مەدخەلیەت ! ) ناو و ناتۆرەنانە لە سەلەفیەکان ، نەک پەوتێکی هاوچەرخ !! وە ئەوەش کاری هاودەمانی جەنابتن : لە تەکفیری و ئیخوانچیە بیدعەکارەکان !!!

بیدعەکاران و ئارەزووپەرستان لە هەر سەدەمێکدا دەسترۆبن و دەستیان بچێت هەوڵی شێواندن و نەهێشتنی ئەم ئوممەتەیان داوە و دەدەن ، بۆیە دەبینین لە هەموو سەردەمەکاندا زانایان و پێشەوایانی ئیسلام ڕووبەڕوویان وەستاونەتەوە ، و بەرهەڵستیان کردوون ، لەبەرامبەریشدا بیدعەکاران ڕێگا و پیلانی خۆیان هەبووە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو هەموو هێرشانەی کە دەکرێنە سەریان ، جا یەکێك لە پیلانەکانیان بریتیبووە ـ هەروەکو پێشتر خرایەڕوو ـ لە ناو وناتۆرەنان بە هەڵگرانی ڕاستەقینەی ئایین ، ئەوەش بەناونانیان بە کەسانێکەوە جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەوەش بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەیان گومانی ئەوەیان پێببات کە دەمارگیرن بۆ ووتەی کەسانێك جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ !!! و پاداگیری دەکەن لەسەر ووتەی شێخ و مامۆستاکانیان ـ بەهەق بێت یان بەناهەق !!! ـ وەکو هەموو گروپ و کۆمەڵە گومڕاکانی تر لەکۆندا ـ هەروەکو لە پرس و باسی پێشوودا خرایەڕوو ـ !!!

بەڵام ئەو کۆمەڵە گومڕایەی کە هەڵگری بەیداخی ئەو کارەیە لەم سەردەمەدا کۆمەڵی ( الإخوان المسلمین ) و ئەو گروپ و تاقمانەی کە لێی کەوتنەتەوە ، لە تەکفیری و سروری و قوتبی ... هتد ... بۆیە ئەم کۆمەڵە و لێبووەکانی چەندەها ناو و ناتۆرەی ناقۆڵایان ناوە بە ئەهلی سوننە و ئەسەرەوە ـ واتە : بە سەلەفیەکانەوە ـ و زاناکانیان بە قێزەونترین شێوە وەسف کردووە ، تەنانەت هەندێکیان گەیاندویانەتە ئاستی تەکفیر کردن و لەئایین دەرکردنیان !!!!

لەوانەش کە بەرامبەر بە سەلەفیەت و زانایانی بەکاریان هێناوە :

کەری موخابەرات !! و نۆکەری کاربەدەستان !! و داردەستی عەلمانیەکان !! و عەمیلی کاربەدەستان !! و عولەمای حەیز و نیفاس !! و مورجیئەکان !! و وەهابیەکان !! و جامیەکان !!!

و لاجەماعەکان !!! مەدخەلیەکان !!! ... هتد .

بێگومان پێشینەشیان هەیە لەم کارەیاندا ، و هەموو خەڵکێکیش میراتگریان هەیە !!! ئەوەتا پێشەوا ( الشَّاطبي ) ـ رَحِمَهُاللَّهُ تَعَالَى ـ بۆمان دەگێڕێتەوە : (( عن إسماعيل بن علية ، قال : حدثني اليسع ، قال : تكلم واصل بن عطاء يوماً ـ يعني : المعتزلي ـ ، فقال عمرو بن عبيد : « أَلاَ تَسْمَعُونَ ؟ مَاْ كَلَامُ الْحَسَنِ وَابْنِ سِيْرِين ـ عِنْدَمَاْ تَسْمَعُونَ ـ إِلَّا خِرْقَة حَيْضٍ مُلْقَاْة »[1] .

و روى أن زعيما من زعماء أهل البدعة كان يريد تفضيل الكلام على الفقه ، فكان يقول : « إِنَّ عِلْمَ الشَّافِعِيِّ وَأَبِي حَنِيْفَة ـ جُمْلَتَهُ ـ لَا يَخْرُجُ مِنْ سَرَاْوِيْلِ امْرَأَةٍ ! »[2] ))[3] ، پێشەوا ( الشَّاطبي ) ـ رَحِمَهُاللَّهُ تَعَالَى ـ لەپاش ئەم ووتانە فەرمووی : (( هذا كلام هؤلاء الزائغين ، قاتلهم اللَّه )) .

ئا مەیە ئەو میراتەی کە بۆ بیدعەکارانی ئیخوان ـ و ئەو کۆمەڵ و گروپانەی کە لێی کەوتوونەتەوە ـ ماوەتەوە و هەندێك کەسی خۆهەڵقورتێنەر لە باس و خواستە شەرعیەکان لاساییان دەکەنەوە !!! لەوەش خراپتر ئەو کارەیان بەناوی سەلەفیەتیەوە !!!

بۆیە دەبێت موسڵمانان بزانن کە ڕەوتێك بوونی نیە بە ناوی (مەدخەلیەتەوە) بەڵکو تۆمەتێکی ئیخوانی و پەلوپۆ گومڕاکانیانە ، و خەڵکانێکی شلڕەو دووبارەی دەکەنەوە و دەینەن بە سەلەفیەکانەوە ، و نکوڵی پێدەکەن لە سەلەفیەت !!!!

---

[1] واتە : ووتەی ئەو دوو پێشەوایە لەلای ئەودا وەکو ئەو پارچە قوماشەیە کە ئافرەت لە سوڕی مانگانە خۆی پێ پاك دەکاتەوە !!!

[2] واتە : زانستی پێشەوا شافعی و ئەبو حەنیفە بەگشتی لە شەرواڵی ئافرەت تێ ناپەڕێت !!!

[3] ( الاعتصام ، للشاطبي : ٢ / ٢٣٩ ) .

- **( کاکە مەلا ! ) ئایا دەزانیت : هیچ زانایەك ئەم بۆچوونە لاروگەوجەی جەنبتیان نەبووە بەرامبەر بە شێخ ( ربیع بن هادي المدخلي ) ؟!، بەڵکو کارەکەتیان بە .... داناوە :**

لارێ و حزبی و دڵ نەخۆشەکان ، ئەوانەی هەڵگری پەیڕەو و پرۆگرامی پوچەڵ و خوار و خێچن ، وەکو پیشەی پێشینانیان ناو و ناتۆرە دەنەنە سەلەفیەکانەوە ، لەوانەش :
(**لاجەماعە !!**) ، و (**مورجیئە !!**) بەڵکو گەشتنە ئەوەی بڵێن : (**غولاتی مورجیئە !!**) ، و (**بەکرێگیراوی کاربەدەستان !!**) ، و (**زانایانی حەیز ونیفاس !!**) ، و (**سیخوڕوموخابەرات !!**) ، و (**وەهابیەکان !!**) ، و ئەمەی کۆتاییشیان نیسبەت بوو بۆ پێشەوا ( محمد ) ـی کوڕی ( عبدالوهاب ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ... ، و دەیان ناو و ناتۆرەی پوچ و بەتاڵی تریش .

بەڵام هەروەکو شاعیر دەڵێت :

لا يضُرُّ البَحْـرَ أَمْسَى زَاخِـراً إِنْ رَمَى فِيـهِ غُـلَامٌ بِحَجَـرٍ .

وە هەر لەم بارەیەوە ووتراوە :

وَكَمْ مِنْ عَائِبٍ قَوْلاً صَحِيْحاً وَآفَتُـهُ مِنَ الْفَهْـمِ السَّقِيْـمِ .

کەچی کاروان هەر بەردەوامە لە ڕۆشتنی خۆیدا سەرباری هەموو ئەوەی کە پێی دەکرێت ، و دەووترێت ، ئەوەتا لەم دواییانەدا هەندێك ناو ناتۆرەی تازەیان بۆ داهێناوین ، کە سەرەتاکانیان دەگەڕێتەوە بۆ کەسانێکی ئیخوانی و سروری و قوتبی ، لەوانەش ئەوەی کە سەری سروریەکان دایهێناوە [1] زاراوەی ( **جامیەکان !!! و جامیەت !!!!** ) ـە ، کە نیسبەتە بۆ زانای بەڕێز و پێشەوا ( محمد أمان بن علي الجاميّ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ !!! لە

---

[1] پاش ئەمیش یەکێك لە سەرانی قاعیدە کە ( أيمن الظواهري ) بوو ، لە هەندێك نوسینەکانیدا هەستا بە بڵاوکردنەوەی ناو و ناتۆرەی ( الجامية ) لە شاخەکانی ئەفغانستان ، و چەند سیفەتێکی دانەپاڵ کە جگە لە جولەکە و خاچ پەرستان نەبێت لە کەسی تردا نەبوو !!!

پاش ئەویش ناو وناتۆرەی ( ***مەدخەلیەکان*** !!! و ***مەدخەلیەت*** !!!! ) ، کە پاش ئەوان خەڵکانێکی نەزان تووتی ئاسا ئەو ناوەیان بۆ سەلەفیەکان دووبارە دەکەنەوە !!!

تایبەت کردنی ئەم ناو وناتۆرەیەش بە شێخ ( محمد أمان الجامی ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ، کە دەڵێن : ( ***جامیەکان*** !!! و ***جامیەت*** !!!! ) ، وە بە شێخ ( ربیع بن هادي المدخلیی ) ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ کە دەڵێن : ( ***مەدخەلیەکان*** !!! و ***مەدخەلیەت*** !!!! ) ، لە کاتێکدا کە چەندەها زانای تر هەبوون ، و هەن ، و هەمان پەیڕەوی ئەوانیان هەبووە ـ لەوانە : ( ابن باز و الألباني ، و ابن العثیمین ، و الوادعي ، و الفوزان ، و اللحیدان ، و الجابري ، ... هتد ) ـ ، بێ مەبەست نەبووە ، چونکە لەپێشتر ئەوەبوو بووترایە : ***بازیەکان*** ، یان : ***عوسەیمینیەکان*** ، یان : ***ئەلبانیەکان*** !!! ، یان : ***فۆزانیەکان*** !!! ، ... هتد ، کەچی ناوی ئەو دوو زانا بەڕێزە لەم بوارەدا زیاتر دەردەکەوێت ، ئەوەش بەبێ مەبەست و هۆکار نیە .

مەبەست و هۆکاری ئەو تایبەت کردنە ئەوەیە کە : ئەم دوو زانا بەڕێزە زیاتر لەوانی تر ئێش و ئازاریان پێگەیاندوون ، و تەخت و بەختیان تێکداوون ، بە نووسین و وتارەکانیان ، و پەردەیان لەسەر چەواشەکاریەکانیان هەڵماڵیوون ... بۆیە زیاتر هەوڵی زڕاندی ناوی ئەم دوو زانا بەڕێزەیان داووە .

لەسەردەمی خۆشیدا ـ و لە فیتنە و ئاشووبەکەی پێشەوا عوسمانی کوڕی عەففاندا رضي الله عنه ـ دامەزرێنەری سەبەئیەکان ( عبداللّـه بن سبأ الیهودي ) دەیووت : (( أَقِيْمُوا هَذَا الأَمْرَ بِالطَّعْنِ فِي عُلَمَـائِهِم ، وَأُمَرَائِهِم )) ، واتە : ئەم کارەتان سەربخەن و جێگیربکەن ، بە تانە و تەشەردان لە زانایان ، و پێشەوایانیان .

وە لە بەرامبەریشدا زانایانی تر دەسەوسان و بێدەنگ نەوەستاوون لە بەرامبەریاندا ، بەڵکو ئەو تۆمەت و ناو و ناتۆرانەیان ڕەتکردووەتەوە ، بە پێچەوانەی نەزان و کۆڵکە خوێندەوار و فسفسپاڵەوانەکانی سەر فەیسبووك کە هەر جار و بەشێوەیەك ، و بەدرۆیەك

ئەم چەواشەكاری و گومڕاییە تازەدەكەنەوە :

✍ لاڕێیەكیان لە پۆستەكەیدا دەیووت : (( *مەدخەلیزم* بریتیە لە ( *بانگەوازێكی كەنیسەیی* !!! ) كە ( *بۆ دوورخستنەوەی گەنجان لە ئیسلام دروست كراوە* !!! ) )) !!!

وە پێشتریش هەر ئەم لاڕێیە بەسەلەفیەكانی دەووت : (( *سەگەفی* )) !!! ، یان دەیووت : (( *مەدخەلیە قۆندەرەكان* )) !!!

وە لەم دواییانەشدا لەسەر پۆستەكانی ( *چالاك حسن* ) دەڵێت :

(( من گەشتومەتە دەرئەنجامی ئەوەی : *ئەو سەلەفیەتە بریتی نیە لە ئیسلامی راستەقینە* بۆیە زوربەی زوری ئەو گروپانە بە تاپۆی خۆیانی دەزانن و بەكەسی تری رەوا نابینن )) !!!

وە دەڵێت : (( ڕاست تر وایە بووتری : *سەلەفیەتی ئەمرۆ ئەوەی ئەم برایانە بانگەشەی بۆ دەكەن* ، بریتیە : *لە كۆمەلە حزب و گروپێكی ناكۆك لە ناویەكدا كە سیان دان بەوانی تریاندا نانێن وهەرخۆیان بەراست دەزانن زۆربەی هەرە زۆری كێشەكانی نێوانیان نە دینەو نە سوننەتە و نە قورئانە بەلكو هەواو ئارەزووحەسادەت وشەری نەفسە* ... )) !!!

وە دەڵێت : (( دیارە من لیرەدا كە باسی سەلەفیەت دەكەم *تەنها مەبەستم سەلەفیەكانی ئەمرۆیە* )) !!!

ئێستاش بە كاكە مەلای هاومەنهەجی خۆی دەڵێت : (( كاتیك ئێمە ووتمان : ( *با مەدخەلی نەبن وسونی بین* !!! ) ، هەڵای زۆری لـێ نرایەوە .

بەڵام ئێستا كە تیری ئەو اجتهاد و بۆچونە هەڵانەی شێخ رەبیع دەگاتە فلان و فیسار ناچار بوو ئەوانیش بێنە سەر ڕاكەی ئێمە .

من ئەوەم پێسەیر نیە ، ئەوەم پێسەیرە كە : خەڵكانێك دوێنێ لەسەر ئەو ووشە زۆر

خراپ دژی ئێمە وەستانەوە ، کەچی ئێستا دیفاع دەکەن لەوانەی هەندێکیان بە مەدخەلی ناو زەرد کردووە ... )) !!!

( **چالاک حسن** ) لە وڵامی ئەم بەرامبەرەیدا ـ سەرباری ئەوەی کە لەکۆمێنتەکەیدا سەلەفیەکان ـ کە ناوی لێناون مەدخەلیەکان !!! ـ بە سوننی نازانێت !!! ، ئەوەش لەوەی کە دەڵێت : (( مەدخەلی نەبن و سونی بین !!! )) !!! ، وە لە پێشتریش سەلەفیەکانی بە ( کەنیسەیی !!! ) و ( دروستکراو !!! ) و ( دوورخەرەوەی گەنجان لە ئیسلام ... هتد !!! ) دادەنا ، ـ دەڵێت : (( دەست خۆش بێت مامۆستای بەڕیز ، ... )) !!

لێرەدا زیاد لەسەر ئەم تەبدیع کردن و هاوڕا بوونەی (**چالاک حسن**) لەسەری !!! ـ هیچی تر ناڵێم ، و تەعلیق بۆ خوێنەران دەهێڵمەوە .

✍ وە چەقاوەسووێکی نوکتەچی سەر فەیسبوك ـ کە هاومەنهەجە لەگەڵ خاوەنی ئەم پۆستەدا ـ پێش ئەم بە سەلەفیەکانی دەووت : (( حزبی سەلەفی )) !!

یان ناوزەدی دەکردن بە : (( حیزبی گومڕا [١] و سەرلێشێواوی سەلەفی )) !!

یان لەوەش زیاتر و خراپتر دەیوت : (( حیزبی گومڕا و موبتەدیعی سەلەفی )) !! ، یان : (( حیزبی موبتەدیع وسەرلێشێواوی سەلەفی )) !! ، یان : (( پاشماوەی حیزبی هەڵوەشاوە و گومڕای سەلەفی )) !! ، یان (( حیزبی گومڕای سەلەفی مەدخەلی )) !!

جارێکی تریش لەم پۆستەی ( **چالاک حسن** ) ـدا دێت ، و ئەمجارەیان دەستخۆشی دەکات لە جەنابیان ، و دەڵێت : (( دەستخۆش دکتۆر گیان ... )) !!!

---

[١] هەر ئەم کاکەیە دەڵێت : (( بەڵام حیزبی گومڕا ئەوەیە : کە جەماعەتێکی دەمارگیر دروست بکات ، قەوارەیەك دروست بکات ، و ( ڕێڕەوی غەیری پێغەمبەر ﷺ هەڵبژێرێ !!! ) ، وەك ئەم ( حیزبە پەرتەوازە بڕبڕەی کە دەیان فیرقەیان لێ بوەتەوە !!! ) .... )) .

کاکە مەلاش ـ واتە : **چالاک حسن** ـ لە وڵامیدا دەڵێت : (( مەمنونم ( مامۆستای بەڕێز !!! ) خوای گەورە ( جەزای خێرت !!! ) بداتەوە )) !!!

بەمەش دەردەکەوێت کە : هاوپەیڕەویە ( ئەمە !! ) و ( ئەویتر !! ) و خاوەن پۆستەکەش زۆرجار کۆدەکاتەوە ، لە مەنزڵگا و شوێن بێت ، یان لە پۆست و کۆمێنتدا !!! جا با موسڵمانان لەمە بەئاگابن !!!

پێشینانیش فەرموویانە : (( الطُّيُورُ عَلَى أَشْكَالِهَا تَقَعُ )) .

✍ تا کار دەگاتە ئەوەی کە ئەم جارەیان ئەم کۆڵکە نەخوێندەوارەیان ـ لە شەریعەتدا ـ دێت و ناو و ناتۆرەی مەدخەلیەت دەنات بەسەلەفیەکانەوە و بەڕەوت باسیان لێوەدەکات ، و دەڵێت : (( مەدخەلیەت ، ڕەوتێکی سونی سەلەفیە )) !!!

خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ كَذَٰلِكَ قَالَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ ۘ تَشَابَهَتْ قُلُوبُهُمْ ۗ قَدْ بَيَّنَّا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ ( البقرة : ١١٨ ) .

وە فەرموویەتی : ﴿ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴾ ( الكهف : ٥ ) .

وە فەرموویەتی : ﴿ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ ﴾ ( الزخرف : ١٩ ) .

**بەهەرحاڵ ( کاکە مەلا ! ) بزانە کە :** سەرباری هاودەنگی هەندێك نەزان لەگەڵ جەنابتدا !!! بەڵام زانایان ئەم بۆچوونە لار وگەوجەی جەنابت و هاوپەیڕەوانتیان ڕەتکردووەتەوە بەرامبەر بە زانایان ، جا بەرامبەر بە شێخ : ( محمد أمان الجامي ) بێت ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ، یان بەرامبەر : شێخ ( ربيع بن هادي المدخلي ) ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ، **وە باسیان لە کارەکەی جەنابت بەم شێوەیەی خوارەوە کردووە :**

✍ پرس و باسی ئەم کارەی جەنابت داهێنانی : (( الألقاب السيئة ؛ ليُنفّر من الحق ))

!!! ، و له : (( عادة أهل الشر إذا أرادوا ـ مثل ما قلنا لكم ـ ينفرون عن أهل الخير بالألقاب )) !!!

✍ یان له پرس و باسی : (( الحسد أو البغضاء فيما بين بعض الناس )) یان زانیووه و ئەژماریان کردووه !!!

✍ یان له پرس و باسی ناو و ناتۆرەنانه به موسڵمانانەوه ، بۆیه فەرموویانه : (( اتركوا هذه الامور والتنابز ، ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ﴾ )) .

✍ وه سەبارەت ئەم کارەی جەنابت فەرموویانه : (( مكيدة لا شك ، ودسيسة لا شك بين الناس ؛ فيجب التنبه لها ، يجب نبذها والابتعاد عنها ، والنهي عنها )) !!!

✍ یان سەبارەتی فەرموویانه : (( إنّ من يقول هذا كقول المُشركين : ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ ﴾ )) !!!

✍ یان ئەم ناو وناتۆرەیه ـ واته : مەدخەلیەت !!! ـ و هاوشێوەکانی له ( وەهابییەت و جامیەت و .... هتد ) یان به ووشەگەلێك داناوه که : (( اخترعها الخُرافيّون والاستعمار البريطانيّ منذُ قرنين أو ثلاثة لتشويه دعوة الشَّيخ مُحمّد بن عبد الوهّاب ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ يجيئون ويُشوّهون السّمعة بقصد تحذير النَّاس من دعوة التّوحيد هذا مثل ما كان كُفّار قريش يقولون عن النّبيّ ﷺ : شاعر ؛ كاهن ؛ يُعلِّمه بشر ؛ وما إلى ذلك من الأعمال التي كانوا يفعلونها )) !!!

✍ یان : ئەوەیه که : (( الخوارج والرّافضة في هذه الأيَّام وغيرهم من دعاة الضَّلال يُردِّدون عن علماء المُسلِمين الذينَ يدعون إلى المنهج الحقّ يُسمّونهم بتسمية يقولون لهُم : ( الجاميَّة ! ) ؛ هذه نظيرُ ( الوهّابيّة ! ) تماماً ! )) !!!

✍ وە ئەم جۆرە دید و بۆچوونانەی جەنابتیان بەوە داناوە كە : (( تصوّرات إبليسيَّة صوّرها إبليس للنّاس ولبَّسَ عليهم وأغواهم فتسلَّط على ضعاف الإيمان فأوقعهم في هذه الحبائل ، ... ، احذروا ـ رحمني اللَّـه وإياكم ـ من هذا التشويه الذي يرتكس فيه أهل كثيرٌ من دعاة الضَّلال ، ... )) !!!

✍ یان ئەم ناو وناتۆرەی جەنابتان بەوە وێنا كردووە كە : (( كلِمَةٌ مِنَ الشَيْطانِ رَدّدها وسَمِعَها بَعْضُ الشَباب ورَدَّدوها معهُ )) !!! ، چونكە زۆرجار : (( الشَيْطانَ يَتكَلّمُ على ألسِنَةِ بَعْضِ النَّاسِ حتى يُنَفْرُوهم عَنِ السُنّةِ ، وينَفْروهم عَنِ الحَقِّ ويُنَفْرُوهم عَنْ مَنْهَجِ السَلَفِ ، هذا خطأ ، لا تَسْمَعْ لهذا الكَلامِ .

مَن قالَ : فيه فِرْقَةٍ جامِيّة !! مَدْخَلِيّة !! قلْ له : ما هو صحِيْح ، ليس بِصَحيحٍ ، فيه عُلَماء يَفْهَمُونَ السَلَفَ ، حَسَد ، هذا حَسَدٌ في قُلُوبِهم مِنَ الشيطانِ ، جاءَ الشَيْطانُ دَخَلَ في قُلوبِهِم ؛ حَسَدوا الشَيْخَ ربيعاً ، ... )) !!!

✍ وە فەرموویانە : (( هذه النَّبَزَةُ والاسم : أوْل مَنْ نَطَقَ بِهِ الشَيْطانُ ، ثُم الإخْوان المُسْلِمون ؛ ليُنَفْروا النّاسَ مِنَ السُنّةِ ، لأنّ الشَيْخَ ربيعاً تكَلّمَ قالَ : الإخْوان المسْلمينَ عِنْدهم أخْطاء ، سيد قطب عنْدهُ أخطاء ، يَنْبَغي النّاسَ يَنْتَبِهوا ، سيْد قُطب لا يَسيرُ على السُنّة عنْدهُ أخْطاء ، فقالوا هؤلاء مداخِلة !! جاميّة !! ضُلّال !! ؛ ليُنَفْروا النَّاسَ ... . فهذه الكَلمة أوْل مَنْ نَطَقَ بِهِ الشَيْطانُ ، ثُم نَطَقَ بِها الإخْوان المُسْلِمون ، وغَيْرهم مِنَ السُرُوريّين ، والصوفِيّينَ ؛ ليُنَفْروا النّاسَ مَنَ السُنّةِ )) !!!

✍ وە هەر سەبەرەت بەم پێشەیەی جەنابت و هاوپەیڕەوانت فەرموویانە : ئەوەی كە پێچەوانەی سەلەفیەكان بێتەوە : (( وينبزهم بـ ( الجاميّة ) ! أو ( المدخليّة ) ! فإنه ضالّ

؛ إنما يحارب السنّة والمنهج السلفي )) !!!

**✍ وە ئەوەشيان دووپات كردووەتەوە كە ئەم كردارەی جەنابت و هاوپەيڕەوانت لە ئاكامدا زيانی خۆتانی تێدايە ، وەك فەرموويانە : (( هذا لا يضر إلا نفسه )) !!!**

**وە ووتەی زانايانيش لەم پرس وباسەدا بەم شێوەيەی خوارەوە دەبێت :**

❑ ووتەی شيخی دكتۆر ( **صالح الفوزان** ) ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ :

**پرسيارێك دەكرێت لە شێخ ( صالح الفوزان ) كە ئەمە دەقەكەيەتی :**

(( نطلب من شيخنا الفاضل التنبيه على أمر ما قد انتشر في الآونة الاخيرة بين الطلاب ألا وهو نبز بعض العلماء الأفاضل على من يستمع اليهم بأنهم هؤلاء جاميون ! وهؤلاء مداخلة ! ويقصدون به شيخنا العالم ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ( محمد أمان الجامي ) و شيخنا الفاضل ـ **حَفِظَهُ اللَّهُ وَسَدَّدَ خُطَاهُ** ـ ( ربيع بن هادي المدخلي ) . وصلى اللّٰـه على نبينا محمد ؟ )) .

**شێخ ( صالح الفوزان ) يش ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە وڵامدا دەفەرموێت :**

**(( اتركوا هذه الأمور والتنابز ، ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ﴾ ( الحجرات : ١١ ) ، اللّٰـه ـ جَلَّ وَعُلا ـ** قال لكم : ﴿ **وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ** ﴾ ( الحجرات : ١١ ) كلكم إخوة ، كلكم أهل دين واحد ، كلكم زملاء وللّٰـه الحمد ، فانبذوا هذه الأمور ، واحترموا العلماء .

**احترموا العلماء ، من لـم يحترم العلماء ؛ فإنه يحرم من علمهم ، يحرم من الاستفادة منهم ؛ فاتركوا هذا الأمر : التنابز بينكم ، وتناول العلماء الذين لهم الفضل ولهم على**

**الناس** الـمنزلـة التي أنزلها اللَّـه فيها : ﴿ **يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ** ﴾ ( المجادلة : ١١ ) ، **فالعلماء لهم مكانتهم ، ولهم قدرهم ، واحترامهم وإذا لم يوثق بالعلماء فبمن يوثق ؟ إذا نزعت الثقة من العلماء فإلى من يرجع الناس ؟ فهذه مكيدة لا شك ، ودسيسة لا شك بين الناس ؛ فيجب التنبه لها ، يجب نبذها والابتعاد عنها ، والنهي عنها ، نعم ))** [1] .

**وە هەر بەڕێزیان ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە وڵامی پرسیارێکدا کە سەبارەت بەناو و ناتۆرەی : ( الجامي ) ـدا هاتووە دەفەرموێت :** (( لا نعرف الجامية ؛ هذا اسمٌ ابتكروه هم ولا نعرفه ، إن كان منسوباً إلى أخينا محمد أمان الجامي فنحن نعرفه ، عالمٌ داعية إلى اللَّـه ما عرفنا منه إلا الحق وما جربنا منه إلَّا الخير ، **ولكن أنتم تعرفون أن هناك من يخترع الألقاب السيئة ؛ ليُنفِّر من الحق ، وهذا لا يضر إلا نفسه .**

الدين منصور وأهل الدين منصورون ، والذي يتخلف عنهم أو يذمهم هذا يضر نفسه فقط ، ولا يضر أهل الخير أبداً )) .

**وە شێخ ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە وڵامی پرسیارێکدا ئاماژە بە هەندێك لە هۆکار و پاڵنەرەکانی ئەم ناو و ناتۆرانەی کردووە ، و فەرموویەتی :** (( هذا ... **من باب الحسد أو البغضاء فيما بين بعض الناس ، ... ، هذه عادة أهل الشر إذا أرادوا ـ مثل ما قلنا لكم ـ ينفرون عن أهل الخير بالألقاب** ، وهي ألقاب ـ وللَّـه الحمد ـ ما فيها سوء ، ... ، و

---

[1] ( محاضرة في الجامعة الإسلامية بعنوان : واجب الطالب الجامعي بعد تخرجه ، يوم الأربعاء ٨/ ٤/ ١٤٣١ هـ بقاعة المحاضرات الكبرى بالجامعة ) .

اللَّـه ما عرفنا عنه إلا الخير ، ولكن الحقد هو الذي يحمل بعض الناس ، وكلٌّ سيتحمل ما يقول يوم القيامة ، ... **والواجب : أن الإنسان يمسك لسانه ما يتكلم بالكلام البذيء** ، والكلام في حق الأموات وحق الدعاة إلى اللَّـه وحق العلماء ، لأنه سيحاسب عما يقول يوم القيامة )) [١] .

**کەواتە بەپێی ئەم ووتانەی شێخ ( صالح الفوزان ) بێت ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى۔ ، ئەم کارەی کە (چالاک حسن) پێی هەستاوە لە ناو وناتۆرەنان بە سەلەفیەکان و زانایانەوە :**

✐ **ناو وناتۆرە نانە بە موسڵمانانەوە و پێچەوانەی ووتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ﴾ ، بۆیە دەبێت موسڵمان وازی لێبهێنێت .**

✐ **بێڕێزیە بەرامبەر بە زانایان و کەمکردنەویە بۆ پلە و پایەیان ، ئەمەش فێڵ و تەڵەکەیە خراوەتە نێو موسڵمانانەوە بۆ دورکردنەوەیان لە زانایان .**

✐ **جۆرێکە لە حەسادەت و ڕقەبەری لە نێوان موسڵماناندا .**

✐ **ئەمە داب و عادەتی خراپەکارانە ، بۆ ئەوەی موسڵمانان لە ئەهلی خێر و چاکە دووربخەنەوە بەم ناو وناتۆرەنانەیان .**



---

[١] ( شرح النونية للشيخ الفوزان ) .

❑ ووتەی شێخی دکتۆر ( **محمد سعيد رسلان** ) ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ:

**شێخ ( محمد سعيد رسلان ) ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە ووتەیەکیدا ـ هەروەك بڵێیت لە وەڵام و بەرپەرچدانەوەی بۆ (چالاك حسن) و هاوپەیڕەوانیدا کە بە سەلەفیەکان دەڵێن : (جامیەکان !!) یان (مەدخەلیەکان !!) فەرمووبێتی ـ دەڵێت :**

(( يقولون : **هؤلاء فرقة !! جزء من السلفيين !! السلفية المدخلية !!!**

ما هي السلفية المدخلية ؟!! هل يستطيعون لها تعريفاً ؟! هل يستطيع أحدهم أن يجعل لها حداً ، تنضبط به ؟!

إن قصدوا أنهم على الكتاب والسنة بفهم أصحاب النبي ومن تبعهم بإحسان ، فلا شك أنهم كذلك ، سموهم ما سموهم ، ولا يضرهم ـ إن شاء اللّـه ـ .

يقولون : **السلفية صارت جماعات !!**

**كيف تكون سلفية ، وتكون جماعات ؟! هذا جمع بين النقيضين !!! لو كانت سلفية ، ما كانت جماعات !! السلفية شيء واحد** ، وكل ما عدا أهل الحق فيها فهم من أهل البدعة : قطبيون ! متأخونون ! تكفيريون ! قل ما شئت !!!

ولكن أهل السنة ممن ينسب إلى السلف ، لا يكونون إلا على الكتاب والسنة ، بفهم الصحابة ومن تبعهم بإحسان .

**ولكن شأن أهل البدعة في كل زمان هو هذا** ، كما قال علماء ، ومنهم أبو عثمان الصابوني ـرَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ في عقيدة السلف .

**إن من شأن أهل البدعة أنهم يلمزون أهل السنة** ، وأهل السنة ينالهم من ذلك قسط مما نال الرسول ﷺ ؛ فإن الكفار نعتوا النبي صلى اللّـه عليه وآله وسلم بالجنون

!! ونعتوا النبي صلى اللَّـه عليه وآله وسلم بالافتراء !! ونعتوا النبي صلى اللَّـه عليه وآله وسلم بأنه ساحر !! وأنه شاعر !! إلى غير ما قالوا من ذلك !!! وهو من كل ذلك بريء صلى اللَّـه وسلم وبارك عليه ، مع الفارق في القياس .

**أهل البدعة في كل عصر يلمزون أهل السنة !! يقولون : هؤلاء ، كما قالوا في القديم : هؤلاء حشوية !! هؤلاء جبرية !! هؤلاء تيوس !! هؤلاء لايفهمون ما يحملون من العلم !! إلى غير ذلك مما قالوا في حق أهل السنة ، وأهل السنة من ذلك براء** ؛ لأن من علامات السني الصحيح ، أن ينعته المرجيء بأنه خارجي ، وأن ينعته الخارجي بأنه مرجيء !! السلفي الحق الذي هو على الجادة يرميه المرجيء بأنه الخارجي !! ويرميه الخارجي بأنه مرجئي !! وما هو إلا على السنة وعلى الجادة ، **فكما قالوا لأسلافنا المتقدمين من أهل السنة : حشوية !! جبرية !! تيوس !! نواصب !! إلى غير ذلك من تلك الألقاب التي تنابزوا بها ، كذلك يقولون في هذا العصر : جامية !! مدخلية !! وأضافوا إليها : رسلانية !! ))** [(١)] .

**وە لـە ووتەکەی ئەم شێخە بەڕێزەشەوە ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى. ئەوە ئاشکرا دەبێت کە :**

**✎ ناو و ناتۆرەنان بە سەلەفیەکانەوە بە ( مەدخەلیەکان ) بێت یان هەر ناوێکی هاوشێوە کۆکردنەوەی دژیەکەکانە چونکە سەلەفیەت نە ڕەوتە و نەش حیزب .**

**✎ ئەم ناو ناتۆرەنانە پیشەی بیدعەکارانە لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا .**

---

[(١)] ( مقطع صوتي للشيخ ، بعنوان : يقولون عنا : مدخلية ! جامية ! فاصبروا يا أهل السنة ) .

❑ ووتەی شێخی دکتۆر ( **صالح بن سعد السحيمي** ) ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ :

**وە هەر لەم پرس و باسەدا پرسیارکرا لە شێخ ( صالح السحيمي ) ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ سەبارەت بەو گەلانەی کە ئەوە بەمەرج دەگرن لەسەر ئەوانەی کە دەیانەوێت حەج بکەن : گوێبیستی زانایانی وەهابی نەبن ، و بەتوندی ئاگاداریان دەکەنەوە !!! بۆیە دەبینیت هەندێکیان کە لەگەڵیاندا دەدوێیت : گوێکانی دەگرێت ، و نایەوێت ببیستێت !!!**

**بەڕێزیشیان ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە وڵامدا فەرمووی :** (( هُوَ صُدَّ عن سبيل اللَّه من البداية ، يعني من البداية صُدَّ عن سبيل اللَّه ، وإنّ من يقول هذا كقول الـمُشركين : ﴿ **وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ** ﴾ والعياذُ باللَّهِ .

شخص يقول لك : قال اللَّه وقال رسوله ؛ كيف لا تسمع له ؟!

**وإنّ كلمة ( الوهَّابيَّةِ ) كلمةٌ اخترعها الخُرافيّون والاستعمار البريطانيّ منذُ منذ قرنين أو ثلاثة لتشويه دعوة الشَّيخ مُحمّد بن عبد الوهّاب ـرَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ؛ يجيئون ويُشوّهون السّمعة بقصد تحذير النَّاس من دعوة التّوحيد هذا مثل ما كان كُفّار قريش يقولون عن النَّبيِّ ﷺ : شاعر ؛ كاهن ؛ يُعلِّمه بشر ؛ وما إلى ذلك من الأعمال التي كانوا يفعلونها .**

**فهذا من الصَّدِّ عن سبيل اللَّه واللَّه لا يُوجَد عندنا شيء أو مذهب يُسمّى الوهَّابيَّةِ !**

**كما أنّ الخوارج ، والرّافضة في هذه الأيّام ، وغيرهم من دعاة الضَّلال يُردِّدون عن** علماء الـمُسلِمين الذينَ يدعون إلى المنهج الحقّ ، يُسمّونهم بتسمية ، يقولون لهُم : ( الجاميَّة ! ) ؛ **هذه نظيرُ ( الوهّابيَّة ! ) تماماً !** وماذا فعل الجامي ـرَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ إلاّ أنّه دعا إلى اللَّه ودعا إلى توحيد اللَّه ودرَّس في هذا المسجد عشرات السّنين هُنَا ، **ثمّ يأتي أولئك الأقزام الجهلة الذينَ رُبَّما كانوا ذوي شهاداتٍ عليا فيصفون أهل المنهج الحقّ يُلقّبونهم بهذه الألقاب بقصد التّشويه** ، و ( الجامي ) قبيلةٌ من قبائل المسلمين في إثيوبيا .

**فكيف تُعيِّر النَّاس بلقب مُسلمٍ عالـمٍ من علماء المسلمين على سبيل التّنقّص ؟**
**فهذه المقصود منها : التّشويه .**

هناك كلمة لشيخنا الشَّيخ مُحمّد ناصر الدِّين الألبانيّ ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ في الرّدّ على هؤلاء لّما سمع من يقول إنّ هؤلاء الوهّابيَّة لا يُحبّون النّبيّ ﷺ ويُركّزون على هذا الكلام الفارغ الذي لا أصل له ، من لا يُحِبّ النّبيّ هل هو مسلم ؟! لا تُحِبّ النّبيّ وتدّعي أنّك مسلم ؟! هذا غير صحيح ، فقال لهم ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ : هؤلاء الذين تقولون إنّهم لا يُحبّون النّبيّ ﷺ يرَوْنَ أنّ الصّلاة على النّبيّ ﷺ في التّشهّد ركنا من أركان الصَّلاة لا تصحّ الصَّلاة بدونه ، وأنتم تُنكرون عليهم ترون أنّ الصّلاة على النّبيّ ﷺ مُجرّد سُنّة أو واجبا عند البعض ؛ يعني : يعتقدون أنها سنة تصحّ الصّلاة بدونها ، فمن الذي يُحبّ النّبيّ : ﷺ الذي يرى أنّ الصّلاة الإبراهيميّة ركن أم الذي يراها دون ذلك ؟!

**إِذَنْ هذه التّصوّرات تصوّرات إبليسيَّة صوّرها إبليس للنّاس ولبَّسَ عليهم وأغواهم فتسلَّط على ضعاف الإيمان فأوقعهم في هذه الحبائل ، فاحذروا من هذا التّشويه .**

**احـذروا ـ رَحِمَنِيَ اللَّهُ وَإِيَّاكُم ـ من هـذا التشويـه الـذي يرتكس فيـه أهـل كثيرٌ من دعـاة الضَّلال ))** [١] .

**وه لەم ووتەيەی شێخ ( صالح السحيمي ) ـشەوە ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ئـەم خاڵانەمان بۆ دەردەكەوێت سەبارەت بە ناو وناتۆرەنان بە سەلەفیەكانەوە :**

**✎ ئەم جۆرە ناو ناتۆرەنانە داهێنراوی داگیركەران و خورافیەكان و خەواریج و**

---

[١] ( شرح كتاب : زيارة القبور والاستنجاد بالمقبور ، لشيخ الإسلام ابن تيمية ، شرح الشيخ صالح بن سعد السّحيمي ، الدَّرس الأوَّل ، ١٠ / من ذي القعدة / ١٤٣٥هـ بالمسجد النّبويّ ) .

لە ڕێباز و مەنهەجی پێغەمبەران نەبووە .علیهم الصلاة والسلام. !؟

**ئەگەر وڵامت بەڵێ بوو ، ئاخۆ ئەمە مانای زیندکردنەوەی دروشمی** ( ما للَّـهِ للَّـه ، و مالقیصر لقیصر ) **نیە !؟** )) !!!

منیش دەڵێم : ئەگەر (*چالاك حسن*) ناتوانێت وڵامت بداتەوە ، ئەوا سەلەفیەکان لە ئەبجەدیاتی پەیڕەویان لە هەموو سەردەم و کاتێکدا ئەوەیە کە : مونازەعەی کاربەدەستی موسڵمانان ناکەن ، و خۆپیشاندان و هاوشێوەکانی بە نادروست دەزانن ، و لە مەنهەجی پێغەمبەری نازانن .علیه الصلاة و السلام. ، سەبارەت بە قەیسەر و داراییەکەشی دەڵێن : ئەوەی کە موڵکی کاتی قەیسەر و جگە لەویشە هەر هەمووی موڵکی حەقیقی پەرستراوی بەحەق ( اللّٰه ) یە .

دروشمەکەشت بەم شێوە دەبێت : (( مَا لِلَّـهِ فَهُو للَّـهِ ، وَ مَا لِقَيْصَر ـ أَيْضاً ـ فَهُو لِلَّـهِ )) .

*حەوتەم*: یان موتەعالیم و خۆلێبووە زانایەکیان دەڵێت :

تێگەیشتنی سەلەفیەکان سەقەتە ـ ئەگەرچی خۆی تا ئێستا نازانێت کە ( ٧٣ ) فیرقەکە کۆمەڵە گومڕاکان و کۆمەڵی ڕزگاربووش دەگرێتەوە !!! ـ ، چونکە بە بچوکترین بیدعە خەڵکی دەنێرن بۆ ( ٧٢ ) فیرقە گومڕاکە ، یان لەبەر ئەوەی کە لە خۆیان نیە لە شێوازی بانگەواز و دەعوەدا ، وە بە هاوشێوەی تەکفیریەکانیان دەزانێت ، و دواتر دێت : جارێك دەینکات بە مورجیئە !!! و جارێکیش بە خەواریج !!! و لە کۆتاشدا بە شیعە !!!

هەروەك لە کۆمێنتەکەیدا دەڵێت : (( ... کێشە لە صحیحی و ضعیفی فەرمودەکە نیە **کێشە لە تێگەیشتنی سەقەتی مەدخەلیەکانە** :

**کە بە بچوکترین بیدعە خەڵکی دەنێرن بۆ ناو ئەو ٧٣ فرقە . هەرکەس لەوان نەبێت و بەو شێوازەی ئەوان بانگەواز و دەعوە نەکات ئەوە لەو حەفتاو سێ فیرقەیە** ...

**جا ئەمانە هەروەك تەکفیرییەکانی سەردەم هاتوون بێ ضبط و ربط کردنی قاعیدة شەرعیەکان و لیك جیاکردنەوەی شروط و موانع کەوتونەتە تبدیعی خەڵك** ...

**جا مدخليەكان** بۆ خۆيان **ئەگەر كەمی تر لە عقيدەی أهلی سنە و جماعە بكۆڵنەوە دەبينن خۆيان مرجئەن** ... وە صيفاتی **خواريجيشيان** تيدايە لە دزايەتی ئەهلی ئيسلام .. وە زۆريش **متعصيبن .. كە ئەوەش صيفاتی شيعەيە** )) !!!!

*هەشتەم* : هاوشێوەی پێشوو يەكێكی دەڵێت : هەنێ سەلەفی بۆ دەسەلات موعتەزيلەن ، بەلام لە گەڵ حيزبە ئيسلاميەكان خەواريجن !!!

هەروەك لە كۆمێنتەكەيدا دەڵێت : (( ... **من هەنێ سەلەفی دەبينم بۆ دەسەلاتدارن دەبنە معتزيلە ، واتە : دەڵێن كاكە مادام لە جنسيەكەی نوسراوە مسلم نابێ زەمی بكەيت ، جا هەر جروجانەوەرێك بێت .**

**بەلام هاتە سەر حزبە اسلاميەكان دەبنە خەوارج ، بە بچوكترين هەڵە دەڵێن خارجی اهلی سنەيە** )) !!!

*نۆيەم* : بەقسەی ئەمەيان بێت سەلەفيەكان هەڵگری فيكرێكی مەترسيدارن ، و زەرەر و زيانيان بۆ موسڵمانان هەيە و مەنهەجيان سەقەتە و نامۆيە بەمەنهەجی سەلەف ، و بەلايەكی گەورەن ، بەلاكەيان لە بەلاكەی داعش كەمتر نيە !!!

هەروەك لە كۆمێنتەكەيان دەڵێت : (( ... دەست خۆش مامۆستا ، **بەلام زۆر زوو لەلايەن خەلكيكی دلسۆز و عەقيدە پاك و خاوەن مەنهەجەوە خەلكيان لەم فكرە و مەترسی عەقيدەی مەدخەليە ئاگادار كردەوە ، كە چەند زەرەر و زيانی بۆ مسولمانان هەيە و چۆن كەوتونەتە ويزەی مسولمانان بەناوی مەنهەجەوە ، بەلام لەلايەن هەموو ئەو مەدخەليانەی كە ئيستا لەلايەن خودی كابرای مەدخەليەوە تەبديع كراون** ، .... .

**ئەوە كی بە مەنهەجی گۆڕيوە ؟؟؟ ئەوە شێخ ڕەبيعە مەنهەجی گۆڕانی بەسەردا هاتوە ؟؟؟ يا ئەوانی ديكەيە ؟؟ ئەوە ئەو برايانەی تر پێشتر هەمان فكرەی جەنابی شێخيان نەبوو ؟؟؟ ئەوە ئەمانن لەمەنهەجە كۆنەكەی كە پێشتر لەسەری بوون لايان داوە يا جەنابی شێخە ؟؟؟**

**لەكۆتايدا دەست خۆشيت ليدەكەم لە ئاگاداركردنەوەی خەلكی لەم مەنهەجە**

**سەقەت و نامۆیە بەمەنهەجی سەلەف کە پیی دەوتریت مەدخەلی بەراستی بەلایەکی گەورەیە بۆ ئەم ئوممەتە کە بەلاکەی لە هی داعش کەمتر نیە ))** !!!

*دەیەم* : یان یەکێکی تریان تانە و توانج لە شێخ ( ربيع بن هادي المدخلي ) ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ دەدات بەوەی کە نە شایەنی ڕێزە و نەش شایەنی شوێنکەوتن !!! هەروەك دەڵێت : (( ... ، **ربيع کەسێك نیە شایەن بە گوێگرتن و شوێنکەوتن بێت** ... ، کەم کەس هەیە لە زمان و فتوای ئەم کەسە پارێزراو بێت ... )) !!!

*یازدەیەم* : یان نەفامێکیان دێت و گاڵتەی پێدەکات و دەڵێت : (( ... **ئەم شیخەش لەتەر ئەخوات و لەوشك ئەخەویت کەچی ئیدیعای سەلەفی بوون دەکات** !!! )) !!!!

*دوازدەیەم* : یان لەوەی پێشوو نەفامتریان دێت دەڵێت :

(( ... بۆ ( ئیمامی شافی ) نافەرمویت : بۆ ناسینی ئەهلی حەق شوین تیری دوژمنان بکەون چوون بۆ کوێ حەق لەوێیە !!!!؟

**ئەی کاك ربيع چەند تیری دوژمنانی بەرکەوتووە ؟ یان خۆی فتوای هینانی کافرانی داوە بۆ خاکی موسولمانان ؟**

... **ئایا کاك ربيع و شوینکەوتووانی نرخی چلە پۆشیکیان لای کافران هەیە و هیچ حسابیکیان بۆ دەکەن ؟؟؟؟**

* ئەهلی سەلەف لەنیوان خۆیاندا بەرەحم و سۆز و میهرە بان نەبوون و بەرامبەر کافران رەق وتوند . **ئایا شیخ و دەرویشەکانی لەسەداسەد بە پیچەوانەی ئەم سیفەتەی سەلەف نین ؟؟ ... براکەم واللە گوناحە و تاوانە بەم ترسنۆك و زەلیلانە بووتریت سەلەفی ، چونکە سەلەف نە ترسنۆك بوون نە زەلیل** )) !!!!

*سێزدەیەم* : پاشا یەکێکی تریان دێت تەبدیعی سەلەفیەکان و مەدخەلیەکانیش دەکات و دەڵێت : (( ... ئێمە ووتمان : با **مەدخەلی نەبن** و **سونی بین** ... )) !!!

کەچی (*کاکە مەلاش*) دەستخۆشی لێدەکات !!!!

*منیش دەڵێم*: ئەم ووتەیە جگە لە تەبدیعکردنی سەلەفیەکان و شێخ ڕەبیع -حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى- ، و بە سوننی دانەنایان !!! هیچ کەودەنیەکی تری لێناخوێنرێتەوە !!! ، ئەگەر بێژەر و دەستخۆشکاری ـ واتە : *چالاک حسن* ـ لێی تێبگەن !!

*چواردەیەم*: پاشان لە هەموو نەفامتریان دێت شێخ ( ربيع بن هادي المدخلي ) -حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى-.دەشوبهێنێت بە سەگ و لە موسڵمانان دەحەپێ !!!!

هەروەك لە کۆمێنتە ڕسواکارەکەیدا دەڵێت : (( ... الله تعالی هیدایەتی شیخ ربیع مدخلی بدات **بەڕاستی دەستێکی باڵای هەیە لو تێکدانی برایەتی لەنێوان موسلمانان** و **بەس بە موسلمانان دەحەبی** )) !!!

*یازدەیەم*: یەکێکی تریان لە بوهتانەکانیدا بۆ سەلەفیەکان دەڵێت :

(( ... زۆر بەڕەقی ـ سەلەفیەکان ـ مامەڵە لەگەڵ ئیسلامیەکانی تردا دەکەن **بەجۆرێك کە وادەزانیت عیلمانی و غەیرە دین زۆر چاکتر و باشترە لایان تاوەکو ئیسلامیەکان** ، ... )) !!!

*شازدەیەم*: نەخوێندەوارێکیشیان لینکی ئەم نوسراوە بڵاو دەکاتەوە لە کۆمێنتەکەیدا کە تێیدا هاتووە : (( **كسر الصنم المدخلي : من أخطاء ربيع المدخلي العقدية** ... هذه طائفة من زلات الشيخ ربيع المدخلي **وأخطائه العقدية** ، ... )) !!!

جا موسڵمانی بەڕێزی دادپەروەر :

ئەگەر (*مەلا چالاک حسن*) ئەم هەموو تانە و تەشەرە و ناو ناتۆرە و .... هتد ، کە بۆ سەلەفیەکان دەکرێت ، بەهۆی ئەو دەرگا شڕەی کە جەنابیان بۆ خەڵکی نەفامی کردووەتەوە نەبێتە ڕاچەڵەکێنەر و بیدارکاری ، لەوەی کە جارێکی تر نەزانی بەخەرج نەدات و هەڵەی وا دووبارە نەکاتەوە ، دەبیت چی لە خەوی غەفڵەت خەبەرداری بکاتەوە ؟!!!!! خوای پەروەردگار لە داوەکانی شەیتان هەموو لایەك بپارێزێت .

❑ ( چالاک حسن ) لەبەرشلێرەوێتی جەنابیان حوکم بەتوندڕەوی لەسەرشێخ ( ربیع بن هادی المدخلی ) .حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى. دەدات :

( چالاک حسن ) سەبارەت بە شێخ ( ربیع بن هادي المدخلي ) .حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى. و حوکمدانەکانی بەسەر موخالیفەکانیدا ـ واتە : بیدعەکاراندا ـ و چۆنێتی مامەڵەکردنی لەگەڵیاندا دەڵێت : (( هەندێ جار زۆر توندە لە حوکم دان بەسەر موخالیفەکانیدا و لە بڕیاردان لە سەر چۆنیەتی مامەڵە کردن لە گەڵیاندا )) !!!

پاشان ئەم کردەوەیەی بەم شێوە وەسف دەکات : (( هەڵبەتە ئەو ئیجتهادانەی شیخ ربیع لەو بوارەدا کەمو کورتی زۆری تێدایە ... )) !!!!

**منیش بە ( چالاک حسن ) دەڵێم** : ئەگەر فەرەزەن ووتەی جەنابت وابێت و شێخ ( ربیع بن هادي المدخلي ) . حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى. توند بێت لە حوکم و مامەڵکردنی لەگەڵ بیدعەکاراندا ، ئایا ئەم سیفەتە بەخراپ دانراوە لەلای پێشین و سەلەفی صالح ؟!! یان بەخراپەدانراوە ـ وەکو جەنابت ئیدیعای دەکەیت و کردووتە بە خاڵێك بۆ تانەدان لە شێخ ( ربیع بن هادي المدخلي ) .حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى. ـ ؟!!

**لە وڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێم :**

(( بێگومان توندوتیژی لە مامەڵەکردن لەگەڵ بیدعەکاراندا پیشەی پێشینانە ( السلف الصالح ) وئەم توندیەیان لە بەرامبەر بیدعەکاران بە ڕەوشتێکی مەزن وچاك داناوە و وەکو وەسف کردنێك باس کراون لە کاتی باسکردنی خاوەنەکەیدا بۆیە چەندین پێشەوا لە پێشەوایانی ئەهلی سوننە لە ژیاننامەکانیاندا وەکو وەسف وچاکە بۆ باسکردنێك وتراوە ( كَانَ شَدِيْداً فِي السُّنَّةِ ، وَشَدِيْداً عَلَى أَهْلِ الْأَهْوَاءِ وَالْبِدَعِ ) واتە : **توند بوو لە دەستگرتن بە سوننەت و دژایەتی کردنی بیدعەکاراندا .**

و تەنها غیرەت بۆ ئەم ئاینە وئامۆژگاریکردنی موسوڵمانان پاڵنەری ئەم توندیەیان بوە . وەکو ( ابن الجوزي ) **لەبارەی پێشەوا ئەحمەدەوە دەڵێت : پێشەوا باوکی** ( عبداللّه ) **ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەبەر توند دەستگرتنی بە سوننەت و نەهیکردنی لەداهێنراوەکان ، قسەی بە کۆمەڵێك پیاوچاك دەکرد ئەگەر پێچەوانەکردنی سوننەتیان لێ بوەشایەتەوە ، وئەو قسانەی وەکو ئامۆژگاری دەکرد** .

بەڵام ئەمڕۆ پێوەرەکان گۆڕاون وئەو باسە گوڕاوە ، تاکو وای لێهاتووە لێبووردن ونەرمی لەگەڵ بیدعەکاراندا بەپێویست وشایستە دادەنرێت ، وتوندی لەگەڵ داهێنراوکاراندا بوە بەتایبەتمەندی خەڵکێکی کەم کە بوون بەجێگەی تانە وتەشەرەی خەڵکی تر .

ئەگەر زانایان وزانست خوازان لە دژی داهێنراو وداهێنراوکاران بە توندی بوەستایەن ودژایەتیان بکردبایە و لەخۆیان دووریان بخستنایەتەوە ئەوە داهێنراوەکان ڕیشەکێش دەبوون ودرێژەیان پێ نەئەدرا ومالەکانمان بە پاکی دەمایەوە وبەسوننەت وئەهلی سوننە ئاوەدان دەبوونەوە .

( ابن القیم ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . دەفەرموێت : (( **هەر کەسێك وردبێتەوە لە حاڵی پێغەمبەران لەگەڵ ئوممەتەکانیاندا دەبینێت هەستاون بە سەرزەنشت وپەسەند نەکردنی خراپەکانیان تاوەکو گەشتنیان بە پەروەردگاریان ، هەروەها وەسێتی ئەوەشیان بە شوێنکەوتوانیان کردووە** ، ولە فەرموودەکانی پیغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە ئەو کەسەی بە هیچ یەك لەدەست وزمان ودڵ بەرپەرچی خراپە نەداتەوە ئەوا بەقەد دەنکە خەرتەلەیەك ئیمانی پێ نیە ، وزۆر زیاد فەرمانی بە فەرمان بە چاکە ونەهی لە خراپە کردوە هەتاوەکو فەرموویەتی : " إن الناس إذا رأوا الظالم فلم يأخذوا على يديه أوشك أن يعمهم اللّه بعقاب من عنده " [(١)] ، واتە : ئەگەر خەڵکی واز لە فەرمان بە چاکە ونەهی لە خراپە بێنن نزیکە لەلای خواوە سزایەکی گشتییان بۆ بێت .

و ئاگاداری کردوینەتەوە وازلێهێنانی دەبێتە ڕێگر لە وەڵامدانەوەی نزای چاکەکاران

---

(١) ( صححه العلامة الألباني في : صحيح الترغيب والترهيب ، برقم : ٢٣١٧ ) .

وهۆکاری بەدەسەڵات بوونی خراپەکاران ، وناکۆکی وجێگیربونی لەعنەتی خوا وەکو چۆن لەعنەتی لەبەنی ئیسرائیل کرد لەبەر وازهێنان لەفەرمان بەچاکە ونەهی لەخراپە )) .

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە توند وتیژی ڕوبەڕووی داهێنراو وداهێنراوکاران دەبوونەوە وبێبەریبوونی خۆیان لەداهێنراوکاران دەردەبڕی وئەمەش ڕوونە بۆ کەسێك لە ژیانیان وردبێتەوە وهەواڵیان بزانێت .

( ابن القیم ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ دەفەرموێت : (( ( عبداللَّه ) ـی **کوڕی عەباس توندتربوو لەدژی قەدەریەکان هەروەها هاوەڵانیش** )) [1] .

ئەوەتا عومەری کوڕی ( خطاب ) سەری ( صبیغ ) ـی کوڕی عەسەل خوێناوی دەکات کاتێك دەبینێت پرسیار دەربارەی موتەشابیهەکانی قورئانەوە دەکات .

سولەیمانی کوڕی یەسار دەفەرموێت : پیاوێك لە بەنی غونەیم ناوی ( صبیغ ) ـی کوڕی عەسەل بوو هات بۆ مەدینە وهەندێك نوسراوی پێبوو ودەستی کرد بەپرسیارکردن دەربارەی موتەشابیهەکانی قورئانەوە ، وئەو باسە گەشت بە عومەر ئەویش کوتووپڕ ناردی بەدوایدا وهەندێك سەعافی خورمای بۆ لێدانی ئامادەکردبوو جا کاتێك هاتە ژوورەوە بۆ لای عومەر و دانیشت ، پێی فەرموو : تۆ کێی ؟ وتی : من بەندەی خوا ( صبیغ ) ـم . عومەر فەرمووی : منیش بەندەی خوام عومەرم . **پاشان دستیکرد بەلێدانی بەو دار سەعافانە تاکو سەری شکاند وخوێن بەناو چاوانیدا هاتە خوارەوە** ، ( صبیغ ) وتی : ئیتر بەسە فەرمان ڕەوای موسوڵمانان سوێند بە خوا ئەوەی لەمێشکمدا بوو ڕۆیشت )) [2] .

ویەحیای کوڕی یەعمور دەفەرموێت : (( یەکەم کەس باسی لەقەدەر کرد لەبەسرە مەعبدی جەهەنی بوو ، من وحەمیدی کوڕی ( عبدالرحمن ) ـی حیمیەری دەرچووین بۆ حەجکردن یان عومرەکردن ، وتمان خوزگە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرمان ﷺ ببینایە

[1] ( شفاء العلیل : ص : ٦٠ ) .

[2] ( شرح السنّة للالکائي : ٣ / ٦٣٥ ـ ٦٣٦ ) .

، و ( عبداللَّـه ) ــی کوری عومەرمان بینی دەڕۆیشتە مزگەوتەکەوە کتوپڕ من وهاوەڵەکەم ئەم دیو و ئەو دیومان گرت ودەمزانی هاوەڵەکەم ڕێگا بە من دەدات قسە بکەم . بۆیە وتم : باوکی ( عبدالرحمن ) خەڵکێك لای ئێمە دەرکەوتوون قورئان خوێنن وبەدوای زانستدا دەگەڕێن ـ وهەندێك باسی کردن ـ ئەوانە دەڵێن : قەدەر نیە ، وشتەکان بەبی قەدەری پێش وەخت دروست دەبن !!!

باوکی ( عبدالرحمن ) فەرموی : سوێند بەوەی ( عبداللَّـه ) ــی کوڕی عومەر سوێندی پێدەخوات ئەگەر هەریەکەیان بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕی هەبێت و لەپێناوی خوا ببیەخشێت خوا لێی وەرناگرێت هەتاوەکو باوەڕ بەقەدەر نەهێنێت )) [1] .

وە **سەمورەی کوڕی جوندوب توندبوو لە دژی خەوارج** [2] .

ئەوەی لە هاوەڵانەوە گێردراوەتەوە لە توندی مامەڵەکردنیان لەگەڵ بیدعەکاران زۆر زۆرن ئەوەی باسکرا مشتێکە لە خەروارێك .

هەروەها پێشەوا وشەیخی ئیسلام ـ ئەبو سەلەمە ـ حەممادی کوڕی سەلەمەی بەسری (ك ١٦٧ ) پێشەوا زەهەبــی لەپێناسەکەیدا دەفەرمێت : شەیخی ئیسلام ئەبو ئیسماعیلی ئەنصاری لەکتێبی فاروقدا دەفەرموێت : ئەحمەدی کوڕی حەنبەڵ دەفەرموێت : ئەگەر پیاوێکت بینی بەخراپە باسی حەممادی کوڕی سەلەمەی کرد ئەوا توومەتباریکە بەدژایەتیکردنی ئیسلام ، **چونکە حەممماد توندوتیژ بوو لەدژی بیدعەکاران** .

وە ئیبن حیببان دەفەرموێت : (( هیچ کەس بەخراپ باسی نەدەکرد جگە لە موعتەزیلە و جەهمیەکان ، چونکە بانگەشی بۆ فەرمودە ڕاستەکان دەکرد )) .

هەروەها بیلالی کوڕی ئەبی بوردە ( ك ١٢٠ ) ئیبن عەساکر بەسەنەدی خۆی دەگێڕێتەوە لەموجاهیدەوە فەرموویەتی : (( پاشان خالیدی کوڕی ( عبداللَّـه ) ــی قەسری کرا بە

---

[1] ( رواه مسلم ، برقم : ٨ ) .

[2] ( الإصابة لابن حجر : ٣ / ١٣٠ ) .

فەرمانڕەوای عێراق ، فەرمانەدەی پولیسەکانی لەواسیت عەمری کوڕی ( عبدالأعلى ) ـی حەکەمی بوو ... وبیلالی کوڕی ئەبی بوردەی بەکارهێنا لەسەر نوێژ وڕوداوەکان ودادوەری ، **بیلالی کوڕی ئەبی بوردە زۆر توند بوو لە دژی بیدعەکاران ... ))** [١] .

هەروەها قازی شورەیکی کوڕی ( عبداللّە ) ـی نەخەعی کوفەیی ( ك ١١٧ ) ، موعاویەی کوڕی صالیح دەڵێت : (( پرسیارم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرد دەبارەی شورەیکەوە ، فەرموی : کەسێکی ڕاستگۆ و وژیر وفەرمودەناس بوو ، **وتوند وتیژ بوو لە دژی داهێنراو وگومانکاران ))** [٢] .

وە ئیبن حەجەر دەفەرموێت : (( کەسێکی دورلەخراپە و چاکەکار بوو **وتوند و تیژ بوو لە دژی داهێنراوەکان ))** [٣] .

قازی شورەیك لە یەکێك لە وتەکانیدا دەفەڕموێت : (( **گەر لە هەرهۆزێکدا گوێدرێژێك هەبێت زۆرم پێخۆشترە لەوەی پیاوێك لە هاوەڵانی فلانی تێدا بێت** . مەبەستی پیاوێك بوو لە داهێنراوکاران )) [٤] .

هەروەها پێشـەوا ( عبدالرحمن ) ـی کوڕی هورموزی ئەعرەج ( ك ١١٧ ) ، و پێشەوا ( عبدالرحمن ) ـی کوڕی قاسم ( ك ١٢٦ ) ـ رحمها اللّه تعالى ـ پێشەوا مالیك لە بارەیانەوە دەفەرموێت : (( **ئیبن هورموز کەم قسەی دەکرد و توند وتیژ بوو لە دژی بیدعەکاران** ، وشارەزاترین کەس بوو لەو بابەتانەی بیدعەکاران لێیان لاداوە ، و ( عبدالرحمن ) **ـی کوڕی**

---

[١] ( تبيين كذب المفتري ، ص : ٨٩ ) .

[٢] ( سير أعلام النبلاء : ٨ / ٢٠٩ ) .

[٣] ( التقريب ، ص : ٤٣٦ ) .

[٤] ( الإبانة لابن بطة : ٢ / ٤٦٩ ) .

**قاسمیش بەو شێوەیە بوو ))** [١] .

و ( عبد السلام ) ـی کوڕی صالیحی هەرەوی لە پێناسەی ئیبراهیمی کوڕی ( طهمان ) ـدا ( ك ١٦٣ ) دەڵێت : (( **زۆر توند بوو لە دژی جەهمیەکان** )) [٢] .

و پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس ( ك ١٧٩ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ دەفەرمویت : (( **سەلام مەکە لە داهێنراوکاران ، ولەگەڵیان دامەنیشە تەنها بە توندی ورەقی نەبێت ، وسەردانی نەخۆشیان ناکرێت** ، وفەرموودەیان لێ ناگێڕدرێتەوە )) .

و دەفەرمویت : (( **لەگەڵ قەدەریدا دامەنیشە قسەی لەگەڵ مەکە تەنها بۆ قسەی توند ولێتـورەبوون نەبێت** ، چونکە خوا دەفەرمویت : ﴿ لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﴾ ( المجادلة : ٢٢ ) ، **بۆیە خۆشەویستیان بۆ مەنوێنن** )) [٣] .

وە پێشەوا موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافعی ( ك ١٩٤ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ بەیهەقی لەبارەیەوە دەفەرمویت : (( **شافعی زۆر توند وتیژ بوو لە دژی بێباوەڕان وداهێنراوکاران وبەشێوەیەکی ئاشکرا ڕقی لێیان بوو ولێیان دوور دەکەوتەوە** )) [٤] .

هەروەها شیخ عەمری کوڕی هارونی بەلخی ( ك ١٩٤ ) ، ئەحمەدی کوڕی حوسەین لە بارەیەوە دەفەرمویت : ئەبو ( عبداللَّه ) ـی ( حافظ ) دەفەرمویت : (( عەمری کوڕی هارونی بەلخی **یەکێك بوو لە ئەهلی سوننە وداکۆکی کاران لە سوننەت** )) .

---

[١] ( مناقب مالك للزواوي ، ص : ١٥٢ ) .

[٢] ( السير : ٧ / ٣٨٠ ) .

[٣] ( الاعتصام للشاطبي : ١ / ١٣١ ) .

واتای ئایەتەکە : نابینیتەوە کەسانێك باوەڕیان بە خوا ورۆژی داوی هەبێت خۆشەویستی بنوێنن بۆ کەسانێك کە دوژمنایەتی خوا وپێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن .

[٤] ( مناقب الشافعي : ١ / ٤٦٩ ) .

وە باوکی ڕەجائی قوتەیبەی کوڕی سەعید دەفەرموێت : (( **عەمری کوڕی هارون توند وتیژ بوو لە دژی مورجیئەکان** وخەلکی لە بەلاّ وخراپەکانیان بە ئاگادەکردەوە )) [٢] .

هەروەها پێشەوا یوسوفی کوڕی یەحیا ( البویطي ) هاوەڵی پێشەوا شافعی لە پێناسەکەیدا وتراوە : (( **ئەو توندوتیژ بوو لە دژی بیدعەکاران** )) [٣] .

ئەبو موسهیر دەڵێت : (( ئەبو ئیسحاقی فەزازی ( ئیبراهیمی کوری موحەممەد ) هات بۆ دیمەشق ، خەلکی کۆبوونەوە بۆ ئەوەی گوێی لێ بگرن ، فەرموی : برۆ بە خەڵکەکە بلێ : **ئەوەی قەدەریە با ئامادەی مەجلیسەکەمان نەبێت** ، **وئەوەی لەسەر بیر ورای فلاّنە با ئامادەی مەجلیسەکەمان نەبێت** . منیش رۆشتم پێیانم راگەیاند )) .

وە پێشەوا زەهەبی لەپێناسەی زانا وفەقیهی مەغریب ( عبدالسلام ) ـی کوڕی حەبیبی تەنوخی قەیرەوانی مالیکیدا ـ خاوەنی کتێبی مودەونە ، دەفەرموێت : لە تاریخی قەیرەوانی ( عبداللّٰه ) ـی کوری موحەممەدا خوێندمەوە ئەڵیت : ئەبو عەرەب ئەڵێت :

چەند ڕەوشتێك لەسەحنوندا کۆبونەتەوە کەمجار لەکەسێکی تردا کۆدەبنەوە ، تێگەیشتنێکی بەتوانا ، وخۆپارێزی لە ئاستی حەرام وگومان لێکراوەکان ، وتنی ڕاستی ، نەویستنی دونیا ، وبەکارنەهێنانی جل وخواردنی گران بەها ، ولێبوردەیی ، وجاری وا بوو سێ دیناری ئاڵتونی دەبەخشی بە دوستانی ، وهیچ شتێکی لەکەس وەرنەدەگرت ، ولە وتنی ڕاستیدا لە هیچ دەسەلاّتێك نەدەترسا ، **وتوند وتیژ بوو لە دژی بیدعەکاران** ، پێشەوایەتیەکەی بەناوبانگ بوو ، و یەك دەنگ بوون لەسەر چاکە وپایە بەرزێتی .

هەروەها ( عبداللّٰه ) ـی کوڕی ئەبی ئیحسانی یەحصوبی ( ك ٢٦٦ ) ئیبن فەرحون لەپێناسەیدا دەڵێت : (( کەسێکی بەخشندە وزمان پاراو وبە توانا بوو لەموجادەلەکردندا ، داکۆکی دەکرد لە سوننەت ، وشوێنکەوتووی مەزهەبی مالیك بوو ، **وتوند وتیژ بوو لە**

---

[١] ( تاریخ دمشق : ٤٥ / ٣٦٥ ) .

[٢] ( تبیین کذب المفتري لابن عساکر ، ص : ٣٤٨ ) .

**دژی بیدعەکاران ))** [١] .

هەروەها عوسمانی کوڕی سەعیدی دارەمی ( ك ٢٨٠ ) ، ئیبن حیببان دەفەرموێت :

(( دارەمی یەکێك بوو لەو فەرمووەدەناسە بەتوانایانەی ، کە خۆ پارێزبوون لە ئاستی حەرام وگومان لێ کراوەکان وفەرمووەدەیەکی زۆری کۆ کردبوە ولە بەر بوو ، وفیقهـ ناسیش بوو ونووسراوی هەبو وفەرمووەدەشی دەگێڕایەوە ، **وسوننەتی بەهێزکردبوو لە شارەکەی خوێدا ، وبانگەشی بۆ دەکرد وداکۆکی لێ دەکرد وبەزێنەری پێچەوانکارانی بوو** ) .

وپێشەوا زەهەبی دەفەرموێت : ( سوننەت لەسەر زمانی ڕەهابوو وشارەزا بوو لە موجادەلەکردندا وچڵەدارێك بوو لە چاوی داهێنراوکاراندا ) [٢] .

وهەر ئەو بوو کە لەدژی موحەممەدی کوڕی کەڕام ـ ئەوەی تاقمی کەڕامییەی دەدرێتە پاڵ ـ هەستاو لەشاری هەڕات دەری کرد [٣] .

وله پێناسەی ئیسماعیلی کوڕی ئیسحاقی قازیدا باسکراوە ( ك ٢٨٢ ) : ( **کە کەسێکی توند وتیژ بوە لە دژی بیدعەکاران** وبۆچوونی وابوە تەوبەیان پێ بکرێت ... ) [٤] .

و قازی ( عیاض ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە پێناسەی ئەبو یوسف جەبەلەی کوڕی حەمودی سـەدەفیدا ـ کە یەکێك بوو لە قوتابیەکانی سەحنون ـ ( ك ٢٩٩ ) لە ژێر ناونیشانی ( **باس کردنی توندی ئەبو یوسف لە دژی بیدعەکاران و دوورکەوتنەوەی لێ یان وبەتوانایی لەو بوارەدا لەبەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار** ) ـدا دەفەرموێت :

(( **ئەبو یوسف ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ زۆر توند بوو لە دژی بیدعەکاران ، ولەو بارەیەوە**

---

[١] ( الديباج المذهب ، ص : ١٣٤ ) .

[٢] ( السير : ١٣ / ٣٢٢ ) .

[٣] ( السير : ١٣/ ٣٢٣ ) ، و ( تذكرة الحفاظ : ٢ / ٦٢٢ ) .

[٤] ( الديباج المذهب ، لابن فرحون / ص : ٩٤ ) .

**چاوپۆشی لە کەس نەدەکرد ، وهیچ کەس لەو زیاتر لەدژی ڕافیزەکان وکۆمەلەکانیان تێ نەدەکۆشا وخواش دەیپاراست لە خراپەیان** ... وناڕەزای دەردەبڕی لەو کەسانەی لە قەیرەوان دەردەچون بۆ سوسە وهاوشێوەکانی بۆ جیهادکردن ودەیفەرموو : تێکۆشان لە دژی ئەوانە ـ واتە : بیدعەکاران ـ لە تێکۆشان لە دژی هاوەڵ بڕیاردان باشترە )) [1] .

هەروەها لە پێناسەی ئەبو جەعفەری موحەممەدی کوڕی عەباسی کوڕی ئەیوبی ئەخرەمدا هاتووە : (( کە کەسێکی دەمارگیربوە بۆ سوننەت ، **و توند و ڕەق بووە لەگەڵ بیدعەکاراندا** )) [2] .

هەروەها باوکی موحەممەدی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی خەلەفی بەربەهاری پێشەوای ئەهلی سوننە لە سەردەمی خویدا ( ك ٣٢٩ ) ، پێشەوا ( زەهبـی ) دەفەرموێت : (( **زۆر حەق بێژ و بانگەشکار بوو بۆ سوننەت و لەبەر خوا لە لۆمەی لۆمە کاران نەدەترسا** )) [3] .

( ابن كثير ) دەفەرموێت : (( زانای دونیا نەویست و فەقیهی حەنبەلی مەزهەب و ئامۆژگاری کاربوو وهاوەڵی مەروەزی وسەهلی تەستوری بوو **وتوند وتیژ بوو لەگەڵ بیدعەکاراندا و زۆر پایەدار بوو** ، عەوام و زاناکانیش ڕێزیان لیّ دەگرت )) [4] .

وە ئیبن ڕەجەب دەفەرموێت : (( **شەیخی ئەهلی سوننە بوو لە سەردەمی خۆیدا وپێشەنگ بوو بۆ ناڕەزای دەربڕین وجیابونەوە لە داهێنراوکاران بەدەست و زمان** )) [5] .

وپێشەوا بەربەهاری چەندین تێکۆشان وپلە وپایەی هەبوو لەئایندا ونەیارەکانی زۆر

---

[1] ( ترتيب المدارك : ٤ / ٣٧٥ ـ ٣٧٦ ) .

[2] ( طبقات المحدثين بأصبهان ، لأبي الشيخ ابن حيان : ٣ / ٤٤٧ ) .

[3] ( السير : ١٥/ ٩٠ ) .

[4] ( البداية والنهاية : ١١ / ٢١٣ ) .

[5] ( طبقات الحنابلة : ٢ / ١٨ ) ، و ( المنهج الأحمد : ٢ / ٢٦ ) .

هەوڵیان دەدا دڵی کاربەدەستانی لێ بگۆڕن [١] .

وله یەکێك له وتەکانیدا دەفەرموێت : (( نمونەی داهێنراوکاران وەکو نمونەی دوپشکە . سەر ولەشی دادەپۆشێ بە گڵ وکلکی دەردەکات ، کاتێك بۆی هەڵکەوێت ژەهرەکەی دەڕژێنێت ، هەروەها بیدعەکارانیش شاراوەن لە ناو خەڵکدا کاتێك بۆیان هەڵدەکەوێت ئەوەی دەیانەوێ دەیگەێنن )) [٢] .

نمونەیەکی درەوشاوەیشمان بۆ دەردەکەوێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ بیدعەکاراندا لە پێناسەی فەرمووده‌ناسی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی ( عون اللّه ) ـی کوڕی حەدیری ئەندەلوسی قورتوبیدا ( ك ٣٨٧ ) ، موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موفەرریج دەڵێت : (( ئەحمەدی کوڕی ( عون اللّه ) **زۆر توندوتیژ بوو لە دژی بیدعەکاران وزەلیلکاریان بوو وبە پەلە بوو لە زیان پێ گەیاندنیان ، زۆر بە توندی هێرشی بەسەریاندا دەکرد ، و هەرکەی بۆی بڕەخسایە ڕاوی ئەنان ودەربەدەری ئەکردن و بیدعەکاران خۆیان لێ دەشاردەوە ودەپاراست ، وچەورەیی ، وئاشتی لەگەڵ هیچ کەسێکیاندا نەدەکرد . وئەگەر بۆی دەربکەوتبایە کەسێك گومرا و بیدعەکارە ئەوە دژایەتی دەکرد وبە ئاشکرا باسی دەکرد وبێ بەرێتی لێ دەردەبڕی ولە کۆبوونەوەکانیدا باسی دەکرد وخەڵکی لێ هان دەدا تاوەکو لە ناو دەچوو یان دەستی لە بیروبۆچونە خراپەکەی هەڵدەگرت** ، وبەبەردەوامی خەریکی تێکۆشان بوو لە پێناوی خوادا هەتاوەکو گەشت بە پەروەدگاری )) [٣] .

هەروەها لەپێناسەی بەکری کوڕی جەعفەری کوڕی ڕاهبی بانگدەردا باسکراوە ( ك ٣٨٠ ) ، جەعفەری کوڕی موحەممەدی موعتەز لە ( تاریخ نسف ) ـدا دەڵێت :

---

[١] ( المنهج الأحمد : ٢ / ٣٧ ) .

[٢] ( طبقات الحنابلة : ٢ / ٤٤ ) .

[٣] ( تاريخ دمشق : ٥ / ١١٨ ) .

(( قورئانی دەخوێند بە شەو وبە ڕۆژ **وتوند وتیژ بوو لەگەڵ بیدعەکاراندا** )) [(١)] .

هەروەها پێشەوا ئەسەدی کوڕی فورات ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ئەسەدی کوری موسای ـ ناسراو بە ( أسد السنة ) ـ نامەیەکی بۆدەنێرێت تێیدا دەنووسێت : (( بزانە ئەی برام ئەوەی پاڵنەرم بوە ئەم نوسراوەت بۆ بنێرم ئەوەیە کە خەڵکی شارەکەت باست دەکەن **خوا چەند ڕەوشتێکی چاکی پێداوی لە دادپەروەری ودەرخستنی سوننەت وناشرین کردنی بیدعەکاران وزۆرباس کردنیان ، وتانەدان لێیان تاوەکو بووە بە هۆی ڕوخاندنیان وپشت ئەستورکردنی ئەهلی سوننە ، وبیدعەکاران پێی زەلیل بوون وبیدعەکانیان داپۆشیوەتەوە . جا برام دڵخۆش بە بە پاداشتی ئەو کارەت ، ولەچاکەکانی تریت بە چاکتری بزانە لە نوێژ وڕۆژو وحەج وتێکۆشان** ، ئەم کردارانە لە چ ئاستێکدان لە چاوی ڕاگرتنی قورئان وزیندووکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ .. دەگێڕنەوە کە خوای گەورە لە ڕووی هەموو داهێنراوێك کە دوژمنایەتی ئیسلامی پێ دەکرێت ، دۆستێکی هەیە داکۆکی لە ئیسلام دەکات ، جا ئەوە بۆ خۆت بەدەست بێنە وبانگەشە بکە بۆ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ تاوەکو دۆستت بۆ دروست دەبێت وخەڵکێك دەبن بە جێ نشینت گەر ڕوداوێکت بەسەردا هات ، وبن بە پێشەوا لەدوای خۆت بۆ ئەوەی پاداشتی ئەم کارەت بۆ بەردەوام بێت هەتاوەکو ڕۆژی دوای وەك لە فەرمودەدا باسکراوە . جا بەزانایی وچاوڕۆشنی ونیەتی چاك وچاوەڕوانی پاداشتەوە کاربکە بۆ ئەوەی خوا خەڵکێکی داهێنراوکار وسەر لێ تێك چووت پێ بگێڕێتەوە بۆ ڕاستی و ببێتە جێ نیشینی پێغەمبەرەکەت ﷺ لەو کارەدا چونکە هیچ کردەوەیەك لای خوای پەروەدگار نابێت بەو کردەوەیە .

**ووریا بە نەکەی یەکێك لەو بیدعەکارانە بکەی بە برا ودۆست وهاوەڵی خۆت یان لەگەڵیان دانیشیت** ... **و پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی کردوە لە بیدعەکان** ، وخوای گەورە نەتەوبەیان لێ وەردەگرێت و نەبەرامبەر و نەفەرز و نەسونەت ، وهەتاوەکو زیاتر خۆیان ماندوو کەن بەنوێژکردن وڕۆژووگرتنەوە زیاتر لە خوا دووردەکەونەوە ، بۆیە لەگەڵیان دامەنیشە

---

[(١)] ( التقييد ، لابن نقطة : ١ / ٢٦٤ ) .

وهەوڵی زەلیلکردنیان بدە ولە خۆتیان دوورخەرەوە ... )) [(١)] .

و لە پێناسەکەیدا باسکراوە کە یەحیای کوڕی سەلام فەرمویەتی : (( ڕۆژێك ئەسەد باسی فەرموودەی بینینی خوای کرد لەڕۆژی دوایدا ولە کۆتایی مەجلیسەکەوە سولەیمانی فەررائی موعتەزیلی دانیشتبوو هەستا و نکۆڵی کرد لە بینیی خوا لە ڕۆژی دوایدا ، کە ئەسەد بیستی ئەوەی وت : **هەستا بۆی وگرتی لەپێش ویەقەی وبەنەعلەکەی هات بەسەر وچاویدا تاوەکو خوێناوی کرد و پاشان لە مەجلیسەکە دەری کرد** )) .

وە لە پێناسەی ئەحمەدی کوڕی ( عبداللّـه ) ـی کوڕی ( خضـر ) ـی کوڕی مەسرور ناسراو بە ئیبن سوسنجەردی ( ك ٤٠٢ ) خەتیبی بەغدادی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ دەفەرموێت : (( کەسێکی متمانە پێکراو وخاوەن دین وبیروباوەڕی چاك بوو **وزۆر توند بوو لە بارەی سوننەتەوە** )) .

هەروەها لەبارەی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی ناسراو بە ئیبن ریزقەوەیهیدا ( ك ٤١٢ ) دەفەرموێت : (( کەسێکی متمانە پێکراو وڕاستگۆ بوو وفەرموودەیەکی زۆری بیستبوو ونوسیبووە ، وبیروباوەڕێکی چاکی هەبوو و بۆچوونەکانی جوان بوون ، وبەردەوام بوو لەسەر قورئان خوێندن **وتوند وتیژبوو لە دژی بیدعەکاران** )) .

وە پێشەوا زەهەبی لە پێناسەی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی موحەمەدی کوڕی موعافیری ئەندەلوسی تەلەمەنکیدا کە زانای خەڵکی قورتوبە بوو ( ك ٤٢٩ ) دەفەرموێت :

(( کەسێکی خاوەن چاکە بوو **بەتوندی دەستی بەسوننەتەوە گرتبوو** ، خەلەفی کوڕی بەشکوال دەفەرموێت : **شمشێرێکی هەڵکێشراو بوو لەدژی خاوەن داهێنراو وئارەزوەکان لە ناوبەریان بوو ، وبە غیرەت بوو بۆ شەریعەت وتوند و بەگوڕ بوو لە پێناوی خوادا** )) [(٢)] .

هەروەها لە پێناسەی فەرموودەناسی ئەندەلوس حەکەمی کوڕی موحەممەدی کوڕی

---

(١) ( البدع والنهي عنها ، لابن وضاح / ص : ٢٨ ـ ٣٢ ) .

(٢) ( تذكرة الحفاظ : ٣ / ١٠٩٨ ـ ١٠٩٩ ) ، و ( السير : ١٧ / ٥٦٨ ) .

حەکەمی کوڕی جوزامی قورتوبیدا دەفەرموێت : (( غەسانی دەڵێت : پیاوێکی چاکەکار ومتمانە پێکراوبوو و خاوەن سەنەد بوو ، **توندبوو لە سوننەتدا وتوند وتیژ بوو لە دژی داهێنراوەکان** ، پاك وخۆپارێز بوو بە ئارام بوو لەگەڵ نەداریدا ، ونەویستی دونیا بوو ودۆستانی دونیایی لا سوك بوو )) [١] .

وە خەتیبی بەغدادی لە پێناسەی ئەبوو مەنسوور ( عبدالملك ) ـی کوڕی موحەممەدی کوڕی یوسوفی بەغدادیدا ( ك ٤٦٠ ) دەفەرموێت : (( لەسەردەمی خۆیدا بێ وێنە بوو لە چاکەکاری و بەردەوامی لە بەخشینی ماڵ و گەڕانەوەی بۆ لای زانایان **وسەرخستنی ئەهلی سوننە ولە ناوبردنی داهێنراوەکان** )) [٢] .

وە ( ابن کثیر ) لە باریەوە دەفەرموێت : ( لە سەردەمی خوێدا بێ وێنەبوو لە فەرمان بەچاکە ونەهی لەخراپە وپەلەکردن لە چاکە **وبەهیزکردنی ئەهلی سوننەت وتوند وتیژی لە دژی بیدعەکاران ولە عنەت لێکردنیان** )) [٣] .

وئەبو حوسەینی فەرراء لە پێناسەی ئەبی جەعفەری کوڕی ئەبی موسای هاشمی حەنبەلیدا ( ك ٤٧٠ ) دەفەرموێت : (( پێنج ساڵ هاوەڵی بووم ، ئەگەر خەبەری خراپەیەکی پێ بگەشتبایە زۆر لەسەری قورس دەبوو ، **وزۆر توند وتیژ بوو لە دژی بیدعەکاران ، وبەردەوام ووتەی بەسەریاندا سەرکەوتوو بوو وەهاوەڵانی دژایەتی بیدعەکارانیان دەکرد** وهیچ کەس ڕێگری لــێ نەدەکردن ، وکەسێکی دەست ودەم پاك بوو )) [٤] .

هەروەها لەپێناسەی ( عبدالرحمن ) ـی کوڕی موحەممەدی کوڕی مەندەدا ( ك ٤٧٠ )

---

[١] ( السير : ١٧ / ٦٥٩ ـ ٦٦٠ ) .

[٢] ( السير : ١٨ / ٣٣٣ ) .

[٣] ( البداية والنهاية : ١٢ / ١٠٣ ) .

[٤] ( طبقات الحنابلة ، لابن أبي يعلى : ١/ ٥٣٨ ) ، وانظر : ( السير : ١٨/ ٥٤٧ ) .

دەڵێت : (( **کەسێکی توند وتیژ بوو لە دژی داهێنراوکاران** و دوورەپەرێز بوو لێیان )) [1] .

وە لە پێناسەی ئەبوعەلی حەسەنی کوڕی ئەحمەدی ناسراو بەئیبن بەننادا ( ت ٤٩١ ) دەڵێت : (( کەسێکی ڕەوان بێژ بوو **وتوند وتیژ بوو لە دژی داهێنراوکاران** )) [2] .

وە لە پێناسەی قازی ئەبوعەلی یەعقوبی کوڕی ئیبراهیمی بەرزینیدا ( ك ٤٨٦ ) دەڵێت : (( **توند بوو لەدەستگرتنی بە سوننەتەوە** )) [3] .

هەروەها زۆرلەو باسانە لەبارەی شەیخی ئیسلام ئەبو ئیسماعیل ( عبداللّٰه ) ی کوڕی موحەممەدی ئەنصاری هەرەویدا وتراوە ( ك ٤٨١ ) ڕەهاوی لە بارەیەوە دەڵێت : (( شەیخی ئیسلام بە ناوبانگ بوو بە حەنبەلێتی **و توند دەستگرتنی بە سوننەتەوە** )) [4] .

وە ئیبن ڕەجەب دەڵێت :(( کەسێکی پایەداری بەڕێز بوو ، وپێشەوایەکی خواناس بوو ، وخوا پەرستێکی دونیا نەویست بوو ، خاوەنی پلە وکەرامات وتێکۆشان بوو ، کەم خەو بوو بەشەوان ، **زۆر بە توندی داکۆکی لە سوننەت دەکرد وسەری دەخست ودژایەتی دوژمنانی سوننەتی دەکرد بویە توشی بەڵامی گەورە دەبوو** ، هەورەها زۆر مەزهەبی پێشەوا ئەحمەدی سەردەخست وڕێزی لێدەگرت )) [5] .

وپێشەوا ( الذهبي ) دەفەرموێت : (( **ئەم پیاوە شمشێرێکی هەڵکێشراو بوو لە دژی ئەهلی کەلام** . **خاوەنی هێرش وسام بوو** ودەرونی خەڵکی شارەکەی داگیر کردبوو زۆر زێدەرەویان دەکردلە ڕێز لێگرتنی و ڕوحی خۆیان دەکردە قوربانی لە جێ بەجێکردنی

---

[1] ( طبقات الحنابلة : ٢ / ٢٤٢ ) .

[2] ( طبقات الحنابلة : ٢ / ٢٤٣ ) .

[3] ( طبقات الحنابلة : ٢ / ٢٤٦ ) .

[4] ( ذيل طبقات الحنابلة : ٣ / ٥٧ ) .

[5] ( ذيل الطبقات : ٣ / ٦٠ ـ ٦١ ) .

فەرمانەکانیدا ، زۆر زیاتر لە کار بەدەستان بەقسەی دەکرا وبەڕێزتر بوو وکێوێکی زۆر پتەو بوو لە سوننەتدا هەرگیز نەدەڕوخا وخاو نەدەبوویەوە ... )) [(١)] .

هەروەها دەفەرموێت : (( **شمشێرێکی هەڵکێشراو بوو لە دژی پێچەوانکاران وچڵە دارێك بوو لە چاوی ئەهلی کەلامدا وکێوێکی نەڕوخاو بوو لە سوننەتدا** )) .

هەورەها دەفەرموێت : (( **چڵەدارێك بوو لە چاوی بیدعەکاراندا وشمشێرێك بوو لە دژی جەهمیەکان** )) [(٢)] .

وە ئیبن جەوزی دەفەرموێت : (( زۆر شەونخونی دەکرد ، وخاوەنی نوسراو بوو ، و فەرموودەی دەگێڕایەوە ، **و کەسێکی توند وتیژ بوو لە دژی بیدعەکاران ، و بەهێز بوو لەسەر خستنی سوننەتدا** )) [(٣)] .

وە لە پێناسەکەیدا هاتووە کە وتویەتی : (( **پێنج جار ڕووبەڕوی شمشێر کرامەوە هیچ جارێکیان پێیان نەدەوتم لە مەزهەبەکەی خۆت پاشگەزبەەروە بەڵکو دەیانوت بێ دەنگ بە لەو کەسانەی ناکۆکن لەگەڵتدا منیش دەم وت : بێ دەنگ نابم** )) [(٤)] .

وە لە پێناسەی مامۆستا ئەبو موحەممەد ( عبداللَّـه ) ــی کوڕی سەهلی ئەنصاڕی موقریئدا ـ شەیخی قورئان خوێنەکانی ئەندەلوس ـ هاتووە ( ك ٤٨٥ ) کە : (( ئەو پێشەوا بوو لە کاتی خۆیدا لەبوارەکەیدا ، و ناوبانگی هەبوو **وزۆر توندو تیژ بوو لە دژی بیدعەکاران وبوێر بوو لە وتنی حەقدا وسام گران بوو** ، وچەندین جار تاقی کراوەتەوە و

---

[(١)] ( السير : ١٨ / ٥٠٩ ) .

[(٢)] ( العبر : ٢ / ٣٤٣ ) .

[(٣)] ( المنتظم : ١٦ / ٢٧٨ ) .

[(٤)] ( السير : ١٨ / ٥٠٩ ) .

دەربەدەرکراوە )) [١] .

وە لە پێناسەی پێشەوا ئەبو موزەفەری سەمعانیدا ( ك ٤٨٩ ) ( ذهبي ) دەفەرموێت : (( کتێبی ( الاصطلام ) ، وکتێبی ( البرهان ) ـی داناوە و کتێبی ( الأماني ) لە فەرموودەدا هی ئەوە و **دەمارگیر بوو بۆ ئەهلی سوننە وجەماعە دڕکێك بوو لە چاوی پێچەوانکارانی وبەڵگەیەك بوو بۆ ئەهلی سوننە** )) [٢] .

وە لە پێناسەی ئەبو ( عبداللّه ) موحەممەدی کوڕی فەرەجدا ( ك ٤٩٧ ) ئیبن فەرحون دەڵێت : (( شەیخێکی بەڕێز و زمان پاراو بوو **وبوێژی ڕاستی بوو وتوند وتیژ بوو لە دژی بیدعەکاران** )) [٣] .

وە لە پێناسـەی ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی زوبـەیری سەقەفیدا دەفەرموێت : (( زۆر بتەو بووو لەحەقدا **وتوند وتیژ بوو لە دژی بیدعەکاران وبەردەوام دەستی بە سوننەتەوە بوو** )) [٤] .

وە موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ( عبدالهادي ) لە پێناسەی شەیخی ئیسلام ئیبن تەیمیەی تێکۆشەر وفەرموودەناس و فیقهناسدا ( ك ٧٢٨ ) ـ ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت ـ دەفەرمێت : (( **ڕوخێنەری بیدعەکاران** )) [٥] .

وە دەفەرمێت : (( **شمشێرێکی ڕاکێشراو بوو لە دژی پێچەوانکاران ، و گرێیەك بوو لە**

---

[١] ( معرفة القراء الكبار ، للذهبي : ١/ ٤٣٦ ) ، و ( لسان الميزان ، لابن حجر : ٣/ ٢٩٨ ) .

[٢] ( السير : ١٩ / ١١٦ ) .

[٣] ( الديباج المذهب ، ص : ٢٧٥ ) .

[٤] ( الديباج المذهب ، ص : ٤٢ ) .

[٥] ( الرد الوافر ، لابن ناصر / ص : ٦٥ ) .

**قوڕگی بیدعەکاران ))** [١] .

وە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی وانی دەڵێت : (( **ڕوخێنەری بیدعەکان وسەرخەری سوننەت بوو ))** [٢] .

شەیخ ( کمال الدین ) ـی کوڕی زەمەلکانی لە بارەیەوە ئەڵێت : (( **سەرخەری سوننەت وڕوخێنەری داهێنراو وبەڵگەی خوا لەسەر بەندەکانی لەسەردەمی خۆیدا وبەرپەرچ کاری لاڕێ خوازان ))** [٣] .

ئەحمەدی کوڕی شەیخی حەزامین لە بارەیەوە دەڵێت : (( **زندووکەرەوەی سوننەت و ڕوخێنەری داهێنراو وسەرخەری فەرموودە ))** [٤] .

و ئەحمەدی کوڕی ( فضل اللّه ) ـی عومەری دەڵێت : (( **ئاگری بیدعەکارانی کۆن وتازەی کوژاندەوە وبیدعەکاران خۆیان لێ دەشاردەوە وەکو خۆشاردنەوە ی ستەمکاران ولەبەردەستیدا بچوك وبێ دەسەڵات دەبوونەوە** وەکو کەسێکی قەرزار لە بەردەستی خاوەن **قەرزدا ))** [٥] .

( عبداللّه ) ـی کوڕی موحیببی مەقدسی دەڵێت : (( کێوی ڕێنمایی و سەرخەری سوننەت و **ڕوخێنەری داهێنراو بوو ))** [٦] .

---

[١] ( العقود الدرّية ، ص : ٧ ) .

[٢] ( الرد الوافر ، ص : ٧٥ ) .

[٣] ( الرد الوافر ، ص : ١٠٨ ـ ١٠٩ ) .

[٤] ( الرد الوافر ، ص : ١٣٠ ) .

[٥] ( الرد الوافر ، ص : ١٤٧ ) .

[٦] ( الرد الوافر ، ص : ١٨١ ) .

وئین لەحامی بەعلی دەڵێت : (( **ڕۆخێنەری داهێنراوەکان بوو** )) [٣] .

وە فەرمووده ناس ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەفەرمێت : (( ئەوە سەرسوڕێنەرە **لە هەموو کەس زیاتر دژایەتی داهێنراوکارانی ڕافیزە وحولولی وئیتیحادی دەکرد** ونوسراوەکانی لەو بارەیەوە زۆرن و ناوبانگیان هەیە وفەتواکانی لەو بارەیەوە ناژمێردرێت )) [٤] .

وبەدرە دینی عەینی دەڵێت : (( **شمشێرێکی تیژ بوو لەدژی داهێنراوکاران** )) [٥] .

وە گوی بگرە لەو دێرە شیعرانەی ( ابن القيم ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. کە دەفەرمویێت :

| | |
|---|---|
| لأجــاهــدنّ عِداك ما أبقيتنـي | ولأجـعلنّ قتــالـهم ديــداني |
| و لأفضحنّهمُ على روس الـمـلا | ولأفــرينّ أديمهــم بلســاني |
| ولأكشفنّ سـرائـراً خفيت علـى | ضعفــاء خلقك منهم ببيـــان |
| و لأتْبعنّهـمُ إلى حيث انتهـــوا | حتى يقــــال أبعـدَ عبّـادان |
| و لأرجمنّـــهم بأعـلام الهـــدى | رجـم المـريد بثاقب الشهبـــان |
| ولأقعـدنّ لهم مـراصـد كيدهـم | ولأحصرنـهم بكل مكـــان |
| و لأجعلنّ لحـومهم ودمـاءهـم | في يـوم نصرك أعظم القربـــان |
| و لأحـملنّ عليهـــمُ بعسـاكـرٍ | ليست تـفرّ إذا التَقَى الزحفـان |
| بعساكر الوحيين والفطرات والـ | ـمعقـول والـمنقـول بالإحسان |
| حتى يبيـن لـمن لـه عقل من الـ | أوْلى بحكم العقـل والبرهـــان |
| و لأنصحنّ اللَّه ثــمّ رسولـــه | وكتــابه وشــرائع الإيمـــان |
| إن شــاء ربي ذا يكون بحولـــه | أو لـم يشـــأ فـالأمــر للرحمن |

---

[٣] ( الرد الوافر ، ص : ١٩٩ ) .

[٤] ( الرد الوافر ، ص : ٢٤٨ ) .

[٥] ( الرد الوافر ، ص : ٢٥٤ ) .

ئایا له دوای ئەم باسانەی پێشەوایانی سەلەف که ڕێڕەوی مامەڵکردنی ئەهلی سوننه لەگەڵ بیدعەکاراندا ڕوون دەکاتەوەه وئەوە دەگەیەنێت که توند وتیژ بوون لەگەڵ بیدعەکاران چاکه کاریه وجێگای ڕێزه .

ئایا بۆهیچ کەسێك [١] دروسته دوای ئەم باسانه یەکێك له ئەهلی سوننه بەخراپ بزانێت وناوی بێنێت لەبەر ئەوەی ئەم ڕەوشته سەلەفیەی تێدا بێت ؟

هەر کەسێك ئەو کاره بکات ئەوه لەپێشدا قسەکەی پێشینان دەگرێتەوه وبەتایبەتی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چونکه ئەوه پێش گشت کەسێك ڕێڕەوی ئەوان بووه وەکو باسمانکرد .

دەی با لەخوا بترسن ئەو کەسانەی ئیدعای شوێنکەوتنی سوننەت دەکەن ولەگەڵ ئەوشدا پشتگیری ناکەن لەئەهلی سوننه ولەو کەسانەی بەڕاستی وزانستەوه داکۆکی دەکەن لەسوننەت ، بەڵکو بەرگری دەکەن لەکەسانی داهێنراوکار ودۆستایەتی دوژمنایەتیان لەسەر دەکەن .

بوون به هۆی چەواشه بوونی گەنجانیك ، وڕێگا ڕاستەکەی خوا ، وڕێگای پێشینانیان لێ بەربەست کردوون بەو هەڵوێستانەیان که ئیسلام وهاوەڵان و وئەهلی سوننه وپێشەواکانیان لێی بێ بەرین . وه بەو کارەیان تاوانێکی زۆر گەورەیان کردوه بەرامبەر به ئیسلام .

پەیرەوکردنی ڕیگای سەلەفی صالح لەمامەڵەکردن لەگەڵ بیدعەکاراندا تەنها ڕێگایەکه بۆ ڕزگاربوون لەم ئاشوبه ، داواکارین لەپەروەردگار پتەومان بکات لەسەر ئیسلام سوننەت .

---

[١] مامۆستای بەڕێز ( **مامۆستا خلیل أحمد** ) دەڵێت : مەگەر کەسانێکی شلڕەوی کەم دین ، که ـ بەداخەوه ـ سەریان هەڵداوه بەناوی حیکمەت ودڵسۆزی وپاراستنی زمان لەغەیبەت وبەرژەوەندی موسڵمانان و ... هتد ، که بەڕاستی هیچ مەنهەجی سەلەفیان بەلاوه گرنگ نیه و زانایانی وەکو : شێخ ئەلبانی و شێخ مقبل و شێخ ڕەبیع ... هتد بەهەڵه دەزان !!! وه له مەجلیسه تایبەتەکانی خۆیان ئەمه دەڵێن ، بەڵام بەئاشکرا خۆیان بەشوێن کەوتوویان دەزانن ، که ئەمەش دوو ڕوویەکی ئاشکرایه .

بەڵام پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بكرێت ئەم توندیە لەدژی پێچەوانكارەكان كە ڕەوشتی ئەو پێشەوایانە بوو ئەوە ناگەیەنێت ئەوان لەسەر ڕەوشتێكی ناشرین بوون بەڵكو ئەوان جوانترین وگەورەترین ڕەوشت وهەڵس وكەوتیان هەبووە هەر لە ئارام گرتن ، ولەسەر خۆی ، وراستگۆی ، وخۆپارێزی لە خراپە ، ورەوشتانێكی تر .

بەڵام دەیانزانی پێویستە لەو حاڵەتەدا ئەو توند وتیژیە بەكار بهێنرێت بۆ ڕووخاندنی ئەو داهێنراوكارانە، بە تایبەتی بانگەشكارەكانیان بۆ ئەوەی خەڵكی لە داهێنراوەكانیان پارێزراوبن ، چونكە دەیانزانی داهێنراو چەندە ترسناكە وهەندێك جار دەبێتە ڕێگای كوفر دووڕووی .

هەموو ئەوانەش دەگەڕێنەوە بۆ دانایی بانگەشكار و شارەزایی لە مامەڵەكردندا .

( ابن القيم ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ دەفەرمویێت : (( یەكێك لە فێڵەكانی شەیتان ئەوەیە لە ڕێگای ڕەوشت جوانی وڕوو خۆشیەوە مرۆڤ دەبات بۆ چەندین تاوان و لە ڕێ دەرچوون ، ئەوەش كاتی گەشتن بە جۆرە كەسێك كە لە خراپەی پارێزراو نابێت تەنها بە ڕووگرژی و پشت لێ كردن نەبێ لێرەدا شەیتان ڕوو خۆشی و زمان شیرینی لا جوان دەكاتەوە هەتاوەكو توشی ئەو كەسە دەبێت ودوای هەرچەند بیەوێت خۆی لێ قوتار كات ناتوانێت ، ودوژمنەكەش لە نێوانیاندا هەوڵ دەدات تاوەكو دەگاتە ئامانجی خۆی ، جا لەم ڕوانگەوە پزیشكانی دڵ وەسێت دەكەن بە دوور گرتن لە داهێنراوكاران وسەلام لێ نەكردنیان ، و ڕوولێ گرژ كردنیان )) وخوا زاناترە [١] .

---

[١] بەهەندێك دەستكاریەوە وەرگیراوە لە پەرتوكی ( إِجْمَاعُ الْعُلَمَاءِ عَلَى الْهَجْرِ وَالتَّحْذِيْرِ مِنْ أَهْلِ الأَهْوَاءِ ، شيخ خالد بن ضحوي الظفيري ) لە وەرگێڕانی : بەڕێز مامۆستا آكو محمد عبداللّه ، بەناونیشانی : یەك دەنگی زانایان لەسەر هەجر و ورياكردنەوە لە بیدعەكاران ( ص ٣٩ ـ ٥٩ ) ، وپێداچوونەوەی : پێداچوونەوەی : مامۆستا خليل أحمد .

❑ ***هاوبەشی پێشەوا ئەلبانی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ وشێخ رەبیع ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە توند و تیژیان لەبەرپەرچدانەوەی موخالفین وبەرهەڵستکاراندا ، کە هەردوکیان بووە پێشەی پێشین :***

ئەمەویێت ـ لەم بەشەدا ـ سەرنجی موسڵمانان بۆ ئەوە رابکێشم کە :

پێشەوا ئەلبانیش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ یەکێکە لەو پێشەوایانەی کە ناسراو بووە بە توندی لە هەندێك لە بەرپەرچدانەوەکانیدا ـ ئەوەش بە دانپیانانی خۆی بەو توندیە ـ !!! بۆیە من ترسی ئەوەم هەیە کە رۆژێکی تر بێت و کە کەسێکی شلرەوی ترمان لێراست بێتەوە و ئەمـجارەیان پێشەوا ئەلبانی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ تۆمەتبار بکات بە توندی ، هەروەك خەڵکانێکی نەزان هەر لە ژیانی خۆیدا ئەو تۆمەتیان بۆ ئەم پێشەوایە کردووە !!!

بەڵام پێشەوا ئەلبانی لە چەند ووتەیەکی جیاوازیدا وڵامی ئەم ووتە و تۆمەتەیەی داوەتەوە و هۆکاری توندیەکەی لەبەرپەرچدانەوەکانی ئاشکرا کردووە ، لەو ووتانەش :

***ووتەی یەکەم*** : (( .. ، كَثيراً ما يسألني بعضهم عن سبب ( الشدة ) التي تبدو أحياناً في بعض كتاباتي في الرد على بعض الكاتبين ضدي ؟

وجواباً عليه أقول : فليعلم هؤلاء القراء أنني بحمد اللَّه لا أبتدئ أحداً يرد عليَّ ردّاً علميَّاً لا تَهَجُّمَ فيه ، بل أنا له من الشاكرين ، وإذا وُجِدَ شيءٌ من تلك الشدة في مكان ما من كتبي ، فذلك يعود إلى حالة من حالتين :

**الأولى : أن تكون ردّاً على مَنْ رد عليَّ ابتداء ، واشتط فيه وأساء إليَّ بهتاً وافتراءً ؛** كمثل أبي غدة ، والأعظمي الذي تستر باسم أرشد السلفي! ، والغماري ، والبوطي ، وغيرهم ؛ كالشيخ إسماعيل الأنصاري غير ما مرة ، وما العهد عنه ببعيد !

**ومثل هؤلاء الظلمة لا يفيد فيهم في اعتقادي الصفح واللين ، بل إنه قد يضرهم ويشجعهم على الاستمرار في بغيهم وعدوانهم** ، كما قال الشاعر :

إِذا أَنْتَ أَكْـــرَمْتَ الكَرِيـمَ مَلَكْتَـهُ وإنْ أَنْتْ أَكْـــرَمْت اللَّئِيـمَ تَـمَـرَّدَا

وَوَضْعُ النَّدَى في مَوْضِعِ السَّيْفِ بالعُلَى مُضِر كَوَضْعِ السَّيْفِ في مَوْضِعِ النَّدَى

**بل إنَّ تـحمُّلَ ظلم مثل هؤلاء المتصدرين لِإرشاد الناس وتعليمهم قد يكون أحياناً فوق الطاقة البشرية ، ولذلك جاءت الشريعة الِإسلامية مراعية لهذه الطاقة ،** فلم تقل ـ والحمد للّـه ـ كما في الِإنجيل المزعوم اليوم : (( مَنْ ضربك على خدك الأيمن ، فأدِرْ له الخد الأيسر ، ومَنْ طلب منك رداءك فأعطه كساءك )) ! ، بل قال تعالى : " فمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فاعْتَدُوا عليهِ بِمِثْلِ ما اعْتَدَى علَيْكُمْ " ، وقال : ﴿ **وَجَزاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُها** ﴾ .

وأنا ذاكر بفضل اللّـه تعالى أنَّ تمام هذه الآية الثانية: ﴿ **فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ. وَلَمَنِ انْتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ .إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ. وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ** ﴾ ، **ولكني أعتقد أنَّ الصفح المشكور والصبر المأجور إنما هو فيمن غلب على الظنِّ أنَّ ذلك ينفع الظالـم ولا يضره ويعزُّ الصابر ولا يذله .**

كما يدل على ذلك سيرته ﷺ العمليَّة مع أعدائه ، وقوله ﷺ : " أشد الناس عذاباً يوم القيامة رجل قتل نبيّاً أو قتله نبي " ( انظر : الصحيحة : ٢٨١ ) .

**وأقل ما يؤخَذُ من هذه الآيات ونحوها ؛ أنها تسمح للمظلوم بالانتصار لنفسه بالحق دون تعدٍّ وظلم ، كقوله تعالى : ﴿ لَا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَنْ ظُلِمَ ﴾ ، والسنة تؤكد ذلك وتوضحه ، كمثل قوله ﷺ لعائشة حين اعتدت إحدى ضرَّاتِها عليها : "**

دونَكِ فانْتَصري " ، قالت : فأقبلتُ عليها حتى رأيتها قد يبس ريقها في فيها ، ما ترد عليَّ شيئاً ، فرأيتُ النبي ﷺ يتهلل وجهه [1] .

فأرجو من أولئك القراء ؛ أن لا يبادروا بالإنكار ، فإني مظلوم من كثير ممَّن يدَّعون العلم ، وقد يكون بعضهم ممَّن يُظَنُّ أنه معنا على منهج السلف ، ولكنه ـ إن كان كذلك ـ فهو ممن أكل البغضُ والحسدُ كبدَه ؛ كما جاء في الحديث : " دبَّ إليكم داءُ الأمم قبلَكم : الحسد ، والبغضاء ، هي الحالقة ، حالقة الدين ، لا حالقة الشعر " ، وهو حديث حسن بمجموع طريقيه عن ابن الزبير وأبي هريرة .

فأرجو من أولئك المتسائلين أن يكونوا واقعيين لا خياليين ، وأن يرضوا مني أن أقف في ردِّي على الظالمين مع قول رب العالمين : ﴿ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴾ .

غير متجاوب مع ذلك الجاهلي القديم :

ألا لَا يَـجْهَلَنْ أحـدٌ عَلَيْنـا فَنَجْهَلَ فَوْقَ جَهْلِ الجَـاهِلِيْنا

عياذاً باللَّـه أن أكون من الجاهلين .

والحالة الأخرى : أن يكون هناك " خطأ فاحش " في حديث ما ، صدر من بعض من عُرِف بقلة التحقيق ، فقد أقسو على مثله في الكلام عليه غيرةً مني على حديث رسول اللَّـه ﷺ ، كقولي الآتي تحت الحديث (١٤٢) : " لم يخجل السيوطي عفا اللَّـه عنا وعنه أن يستشهد بهذا الإسناد الباطل ، فإنَّ ( أبو الدنيا ) هذا أَفَّاك كذَّاب

---

[1] ( رواه البخاري في : الأدب المفرد ، وغيره بسند صحيح ، وهو مخرج في المجلد الرابع من : الصحيحة ، ١٨٦٢ ) .

، لا يخفى حاله على السيوطي ... " .

**فإنَّ الباعث على هذه ( الشدة ) إنما هو الغيرة على حديثه ﷺ أن يُنْسَبَ إِليه ما لم يقله ، وسلفنا في ذلك بعض الحفاظ المعروفين بالدين والتقوى ... .**

**... ، ونحو هذا من الإِفك الذي لا يصدُرُ من كاتب مخلصٍ يبتغي وجه الحق ! ، وينفع فيه اللِّين والأسلوب الهيِّن في الردِّ عليه ، لأنه مكابرٌ شديدُ المكابَرة والتمحُّل لتسليك أخطاءِ غير الألباني مع ظهورها ، بقدرِ ما يتكلَّف في توهيمِه وتجهيلهِ ـ ولو ببتر كلام العلماء ، وتضليل القرَّاء ـ ليستقيمَ ردُّهُ عليهِ !!**

وهو في بعض ما أخذهُ عليَّ ظلماً في " نقده " هذا قد سبقهُ إليه الكوثري الصغير أبو غدَّة الحلبي ، الذي كنتُ رددتُ عليه في مقدِّمة تخريج " شرح الطحاوية " ، **فالتقاؤهُ معه في ذلك ممَّا يدلُّ على أنَّه لا يتحرَّجُ في أن يتعاوَنَ مع بعضِ أهلِ الأهواء في الردِّ على أهل السنَّة ! ، فلا أدري واللَّه كيف يكون مثلُه باحثاً في دارِ الإِفتاء** ؛ وفيها كبارُ العلماء الذين لا يمكن أن يخفى عليهِم حال هذا الباحث في انحرافِهِ في الرَّدِّ عن الأسلوب العلميِّ النَّزيه إلى طريقتِه المبتَدَعة في اتِّهامه لَمِن خالفه من أهل السنَّة بالبهت ، والافتراء ، والتدليس ، وتحريف الكلم عن مواضعه ، وتتبُّع العَثرات ؟!

... ، ومعذرةً إلى القراء الكرام ؛ إذا أنا أطلتُ في هذه المقدِّمة ؛ لأنَّ الغرض أن نُبَصِّرَهُم بحال بعض الطاعنين فيَّ بغير حقٍّ بقلم غيري من الكُتَّاب المنصِفينَ الحيادِيِّينَ ، ولكي لا يُبادِروا إلى استنكار ما قد **يَجِدون منِّي من ( الشدة ) أحياناً في الردِّ على بعض النَّاقدين بأهوائِهِم وبغير علمٍ .**

**فقديماً قالوا : " قال الحائطُ للوتد : لـم تشقُّني ؟! قال : سَلْ مَنْ يدقُّني " .**

راجياً ألا يحمِلوني أن أتمثَّل بقول الشاعر :

**غَيْرِي جَنَى وأَنَا الـمُعَذَّبُ فيكُمُ فكَـــأنني سَبَّـــابَةُ الـمتنـــدم ))** (١) .

**ووتەی دووەم** : (( ولما كان لتأليف الرسالة المذكورة يومئذ ظروف خاصة وملابسات معينة اقتضت الحكمة أن يكون أسلوبها على خلاف البحث الهادئ والاستدلال الرصين ؛ ذلك أنها كانت رداً على أناس لم تعجبهم دعوتنا إلى الكتاب والسنة على منهج السلف الصالح وخطة الأئمة الأربعة وغيرهم ممن اتبعوهم بإحسان فبادؤونا بالتأليف والرد ، وليته كان رداً علمياً هادئاً ؛ إذن لقابلتهم بأحسن منه ، ولكنه لـم يكن كذلك مع الأسف ، بل كان مـجرداً عن أي بحث علمي مملئاً بالسباب والشتائم وابتكار التهم التي لـم تسمع من قبل ، **لذلك لـم نر يومئذ أنَّ من الحكمة السكوت عنهم وتركهم ينشرون رسائلهم بين الناس دون أن يكون لدى هؤلاء مؤلَّف يكشف القناع عما فيها من الجهل والتهم : ﴿ لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ ﴾ ، لذلك كان لا بد من الرد عليهم بأسمائهم ....**

**وقد يكون فيها شيء من القسوة أو ( الشدة ) في الأسلوب ، في رأي بعض الناس الذين يتظاهرون بامتعاظهم من الرد على المخالفين المفترين ، ويودون لو أنهم تُركوا**

---

(١) **( قاله ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ في مقدمة سلسلة الأحاديث الضعيفة ، الجزء الأول ) .**

**وقال ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ في جوابـه عمن يتهمونه بالشدة والـحدة في ردوده على مـخالفيه كالصابونـي : (( لَا أُنْكِرُ أَنَّ عِنْدِي شِدَّةٌ ، وَلِكِن أَعْتَقِدُ أَنَّ هَذِه الشِّدَّة أَضَعُهَاْ فِي مَحَلِّهَا ، فِي مَكَاْنِهَا الْـمُنَاْسِبُ ))** ( سلسلة الهدى والنور : شريط رقم : ٢٧٧ ) .

دون أن يحاسبوا على جهلهم وتهمتهم للأبرياء ، متوهمين أنَّ السكوت عنهم هو من التسامح الذي قد يدخل في مثل قوله تعالى : ﴿ وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلاماً ﴾ ، وينسون أو يتناسون أنَّ ذلك مما يعينهم على الاستمرار على ضلالهم وإضلالهم للأخرين ؛ واللَّـه عز وجل يقول : ﴿ وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ﴾ ، وأيُّ أثم وعدوان أشد من اتهام المسلم بما ليس فيه ؛ بل بخلاف ما هو عليه ؟! ، ولو أنَّ بعض هؤلاء المتظاهرين بما ذكرنا أصابه من الاعتداء دون ما أصابنا لسارع إلى الرد ولسان حاله ينشد : ألا لا يجلهنَّ أحد علينا فنجهل فوق جهل الجاهلين ))[1] .

**وتەی سێیەم** : (( هذا وقد نمي إليَّ أنَّ بعض الأساتذة رأى في ردي هذا على الدكتور شيئاً من ( الشدة ) والقسوة في بعض الأحيان ، مما لا يعهدون مثله في سائر كتاباتي وردودي العلمية ، وتمنوا أنه لو كان رداً علمياً محضاً .

فأقول : إنني أعتقد اعتقاداً جازماً أنني لـم أفعل إلا ما يجوز لي شرعاً ، وأنه لا سبيل لمنصف إلى انتقادنا ! ، كيف واللَّـه عز وجل يقول في كتابه الكريم في وصف عباده المؤمنين : ﴿ وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ * وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ * وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُوْلَئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ * إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُوْلَئِكَ لَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ * وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الأُمُورِ ﴾ ؟

---

[1] ( قاله الإمام الشيخ الألباني ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ في : مقدمة الطبعة الرابعة من تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد ) .

فإنَّ كلَّ مَنْ يتتبع ما يكتبه الدكتور البوطي في كتبه ورسائله ويتحدَّث به في خطبه ومجالسه يجده لا يفتأ يتهجَّم فيها على السلفيين عامة وعليَّ من دونهم خاصة ، ويشهِّر بهم بين العامة والغوغاء ، ويرميهم بالجهل والضلال وبالتبله والجنون ، ويلقبهم بـالسفليين والسخفيين ، وليس هذا فقط ، بل هو يحاول أن يثير الحكام ضدهم برميه إياهم بأنهم عملاء للاستعمار ! ، إلى غير ذلك من الأكاذيب والترهات ... .

ذلك قليل من كثير من افتراءات الدكتور البوطي وترهاته الذي أشفق عليه ذلك البعض أن قسونا عليه أحيانا في الرد ، ولعله قد تبين لهم أننا كنا معذورين في ذلك ، وأننا لم نستوف حقنا منه بعد : ﴿ وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ﴾ ، ولكن لن نستطيع الاستيفاء لأنَّ الافتراء لا يجوز مقابلته بمثله ، وكل الذي صنعته أنني بينتُ جهله في هذا العلم ، وتطفله عليه ، ومخالفته للعلماء ، وافتراءه عليهم وعلى الأبرياء بصورة رهيبة لا تكاد تصدق ، فمن شاء أن يأخذ فكرة سريعة عن ذلك فليرجع إلى فهرس الرسالة هذه ير العجب العجاب .

هذا وهناك سبب أقوى استوجب القسوة المذكورة في الرد ينبغي على ذلك البعض المشفق على الدكتور أن يدركه ألا وهو : جلالة الموضوع وخطورته الذي خاض فيه الدكتور بغير علم مع التبجح والادعاء الفارغ الذي لم يسبق إليه ؛ فصحَّح أحاديث وأخباراً كثيرة لم يقل بصحتها أحد ! ، وضعَّف أحاديث أخرى تعصباً للمذهب وهي ثابتة عند أهل العلم بهذا الفن والمشرب ! ، مع جهله التام بمصطلح الحديث وتراجم رواته ! ، وإعراضه عن الاستفادة من أهل العلم العارفين به ! ، ففتح بذلك باباً خطيراً أمام الجهال وأهل الأهواء أن يصححوا من الأحاديث ما

شاءوا ، ويضعِّفوا ما أرادوا ، " ومَنْ سنَّ في الإسلام سنة سيئة فعليه وزرها ووزر من عمل بها إلى يوم القيامة " .

وسبحان اللَّه العظيم ؛ إنَّ الدكتور ما يفتأ يتهم السلفيين في جملة ما يتهمهم به بأنهم يجتهدون في الفقه وإنْ لم يكونوا أهلاً لذلك ، فإذا به يقع فيما هو شر مما اتهمهم به تحقيقاً منه للأثر السائر : " من حفر بئراً لأخيه وقع فيه " ، أم أنَّ الدكتور يرى أنَّ الاجتهاد في علم الحديث من غير المجتهد بل من جاهل يجوز وإن كان هذا العلم يقوم عليه الفقه كله أو جله ؟!

**من أجل ذلك ؛ فإني أرى من الواجب على أولئك المشفقين على الدكتور أن ينصحوه " والدين النصيحة " ، بأن يتراجع عن كل جهالاته وافتراءاته ، وأن يمسك قلمه ولسانه عن الخوض في مثلها مرة أخرى ؛ عملاً بقول نبينا محمد ﷺ : " انصر أخاك ظالماً أو مظلوماً " ، قيل : كيف أنصره ظالماً ؟ قال : " تحجزه عن الظلم ؛ فإنَّ ذلك نصره "** [١] .

**فإن استجاب الدكتور فذلك ما نرجو ، و " عَفَا اللَّـهُ عَمَّا سَلَفَ " ، وإن كانت الأخرى فلا يلومنَّ إلا نفسه** ، والعاقبة للمتقين .

وصدق اللَّه العظيم إذ يقول : ﴿ **إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ * يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ** ﴾ )) [٢] .

---

[١] ( أخرجه البخاري من حديث أنس ومسلم من حديث جابر وهو مخرج في الإرواء : ٢٥١٥ ) .

[٢] ( قاله الإمام الشيخ الألباني ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ في مقدمة كتابه : دفاع عن الحديث النبوي

ئەمانەی سەرەوە هەندێك ووتە بوون پێشەوا ئەلبانی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ تیایاندا ولامی ئەوانەی تێیدا خستنەڕوو کە نکوڵی لە توند و تیژی بەرێزیان دەکەن لەبەرپەرچدانەوەی بۆ موخالفین و بەرهەڵستکارانی ، و تێیدا هەندێك بەهانە و بەڵگەی خستووەتە ڕوو بۆ ئەو کارەی ، *لە بەهانەکانیشی* :

*یەکەم* : غەیرەی ئەم پێشەوایە لەبەرامبەر ئەو نەزانیانە ئاشکرایانەی کە لە کەسانێکی نەزانەوە دەکرێت بەرامبەر بە سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە پێشینیش بەهەمان شێوە پێی هەستاوون ـ وەکو پێشەوا دەڵێت ـ .

*دووەم* : ستەمی هەندێك لەو کەسایەتیانە ـ کە بەرپەرچی داونەتەوە ـ لە پەیڕەو و مەنهەجی سەلەفی صالح و سەلەفیەت ... هتد .

*سێیەم* : هۆکارێکی تر کە پێشەوا ئەلبانی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ بە بەهانەی دەهێنیتەوە بۆ توند و تیژیەکەی لە گەڵ موخالفین و بەرهەڵستکارانی : گەورەیی و شکۆداری و مەترسیدارێتی ئەو پرس و باسانەیە کە موخالفین بە بێ زانست و بە ملهوڕی و لاف وگەزافی پوچەڵەوە ـ بە بێ هیچ پێشینێك ـ دەستیان تێوەرداوە و باسی لێوە دەکەن !!! و ناشکرێت زانایان لێی بیدەنگ بن و بەرپەرچیان نەدەنەوە .

دەسا با ( *چالاك حسن* ) کە ڕووی تیر و توانجەکانی کردووەتە شێخ ( ربيع بن هادي المدخلي ) ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ، و بەو کارە تۆمەتباری دەکات کە گوایا توندە بەرامبەر بە موخالفینی !!! ، و هۆکاری تەفریقەیە !!! ، و سەلەفیەکانی شایستەکردووە کە بە مەدخەلیەکان ناوزەد بکرێن !!! بەهەمان شێوەش بەرامبەر بە پێشەوا ئەلبانیش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ هەمان کار ئەنجام بدات لەکاتێکدا کە خودی ئەم پێشەوایە نکوڵی لە توند و تیژی خۆی ناکات بەرامبەر بە موخالفین و بەرهەڵستکارانی لە بەرپەرچدانەوەکانی !!!! ، و

---

والسيرة ، في رده على كتاب : فقه السيرة ، لمحمد سعيد البوطي ) .

تەنانەت بەهانەش بۆ دروستێتی کارەکەی دەهێنێتەوە !!!!

یان دەبێت ـ ئەگەر بیانووەکانی بە دروست دەزانێت ـ هەمـان بەهـانـەش بـۆ شێخ ( ربیع بن هادي المدخلي ) ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ بهێنەیتەوە کە پێشەوا ئەلبانی ـرَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ بۆ خۆی هیناویەتیەوە ، *چونکە کارەکەی ئەمیش*:

*یەکەم*: غەیرەیە لەبەرامبەر ئەو نەزانینانە ئاشکرایانەی کە لە کەسانێکی نەزانەوە دەکرێت بەرامبەر بە مەنهەج و بیروبارەڕی سەلەفیەت ، و بنەواکانی ، لە کاتێکدا کە پێشینیش بەهەمان شێوەی ئەم شێخە بەڕێزە ـ بگرە بە توندتریش ـ پێی هەستاوون لە بەرامبەر بیدعەکارن و موخالفیندا .

*دووەم*: ستەمی هەندێك لەو کەسایەتیانە ـ کە بەرپەرچی داونەتەوە ـ لە پەیڕەو و مەنهەجی سەلەفی صالّح و سەلەفیەت ... هتد .

*سێیەم*: گەورەیی و شکۆداری و مەترسیدارێتی ئەو پرس و باسانەیە کە موخالفین بە بێ زانست و بە ملهوڕی و لاف وگەزافی پوچەڵەوە ـ بە بێ هیچ پێشینێك ـ دەستیان تێوەرداوە و باسی لێوە دەکەن !!! و ناشکرێت زانایان ـ لەوانیش شێخ ( ربیع ) ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لێی بیدەنگ بن و بەرپەرچیان نەدەنەوە .

خۆ ناکرێت بە دوو پێوەرە کردەوەیەکی هاوشێوە لە دوو تاکی جیاوازدا بپێوێت !!!! یان سیاسەتە میکافیلیەکەی جارێکی تر دەخاتەوە جۆش و خرۆش و بەو پێوەرە حوکم لەسەر ئەم دوو بەڕێزە بدات !!!!!!

وە ئـەوەش لـە (*چالاك حسن*) دەپرسم ـ لە پاش ئەم باسکردن و خستەنەڕووەمـان بۆ ووتەکانی پێشەوا ئەلبانی ـرَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لەم پرس و باسەدا ـ : ئایا وەسفکردنی هەنـدێك لە بەرپەرچـدانەوەکانی شێـخ ئەلبانی بە (*توندی*ـالشدة) لەلایەن هەندێکەوە ، و دانپیانانی خۆدی پێشەواش ـرَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ بەم ڕاستیە ، ڕێگەی ئەوە دەدات بە کۆمەڵە

خەڵکێك ( *خۆی ئاسا* ) ئەم پێشەوایە وەسف بکەن بە : توندێتی !!! و زیادڕەویتی لە بەرپەرچدانەوەی بەرهەڵستکاران و موخالیفەکانی !!! و بە پێچەوانە و جیاواز دابنرێت بۆ پەیڕەوی زانایانی سەردەم و پێشین !!! ، و دواتریش : ناو ناتۆرەش بنرێت بە شوێنکەوتوانی ئەم پێشەوایە بە ئەلبانیەکان ؟!!!!!

وە پاشان ناشـزانم کە جـەنابی (*چالاك حسن*) بەرامبەر بەم ووتانەی پێشەوا ئەلبانی .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. چی دەڵێت ؟!!

وە ئایا ئەوەی کە بۆ شێخ ( ربيع بن هادي المدخلي ) .حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى. بەڕەوای زانی لە ناو ناتۆرە نان بەهەمان شێوە بۆ پێشەوا ئەلبانیش .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. بە ڕەوای دەزانێت ؟!!!

بە واتایەکی تر : ئایا ئەمــجارە ڕەوتێکی تر لە سەلەفیەکان جیادەکاتەوە و ناویان لێدەنێت : *ئەلبانیەکان* !!! یان دیسانەوە بۆچوونە میکافیلیەکەی دەخاتەوەکار بۆ دروستێتی و نادروستێتی ئەو کارە ؟!!!

من باشترین گومانم ئەوەیە کە وڵامی ( *چالاك حسن* ) بەم شێوە دەبێت کە لە پۆستێکی پێشوی لەم پۆستەیدا خستوویەتی ڕوو ، لە ژێر ناونیشانی : (( ڕەحمەتتان لێبێت بازنەی ئیسلام بچوك مەکەنەوە !!! )) ، و تێیدا دەڵێت :

(( ئیسلام دینی خوای گەورەیە و کەس بۆی نیە بە هەوا و ئارەزوی خۆی کەس لە بازنەکەی بکاتە دەرەوە بەهۆی تاوان ولادانێکەوە کە خودی دینەکەمان بەو تاوانانە کەس ناکاتە دەرەوە لە بازنەکەی .

هەروەها لەناو بازنەی مەنهەجی ڕاست و صەحیحی سەلەف و پێشینانمان کەس ناکرێتە دەرەوە بە بێ بەڵگە و بە ئارەزوی کەس .

بۆیە پێویستە خۆمان بەدور بگرین لە ناو و ناتۆرە دروستکردن بۆ برا موسڵمانەکانمان و دروستکردنی تەفرەقە و دوبەرەکی .

بۆیە هەڵەیەکی گەورەیە گەر ناوی ....... بنەینە براکانمانەوە بەس لەبەر ئەوەی لە

هەندێ ڕووەوە خیلافمان لەگەڵیاندا هەبو ، ... )) !!!!

بەڵام ـ ئەگەر یەکێك بیەوێ ـ ووتەی من وەکو سەلەفیەك ـ واشدەزانم ووتەی هەموو سەلەفیەکی تریش ـ ئەوەیە کە پێشەوا ئەلبانی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی :

(( نحن بلا شك نحمد اللّـه ـ عَزَّ وَجَلَّ ـ أن سخر لهذه الدعوة الصالحة القائمة على الكتاب والسنة على منهج السلف الصالح ، دعاة عديدين في مختلف البلاد الإسلامية يقومون بالفرض الكفائي الذي قلَّ من يقوم به في العالـم الإسلامي اليوم ، فالحط على هذين الشيخين : الشيخ ربيع والشيخ مقبل ؛ الداعيين إلى الكتاب والسنة ، وما كان عليه السلف الصالح ومحاربة الذين يخالفون هذا المنهج الصحيح هو كما لا يخفى على الجميع إنما يصدر من أحد رجلين : إما من جاهل !! أو صاحب هوى !!!

الجاهل يمكن هدايته ؛ لأنه يظن أنه على شيء من العلم ، فإذا تبين العلم الصحيح اهتدى .. ، أما صاحب الهوى فليس لنا إليه سبيل ، إلا أن يهديه اللّـه ـ تَبَارَكَ وَتَعَالَى ـ فهؤلاء الذين ينتقدون الشيخين كما ذكرنا : إما جاهل فيُعلَّم ، وإما صاحب هوى فيُستعاذ باللّـه من شره ، ونطلب من اللّـه ـ عَزَّ وَجَلَّ ـ إما أن يهديه ، وإما أن يقصم ظهره )) .

**لە کۆتایی ئەم بەشەشدا دەڵێم :**

ئەوەی کە نکوڵی لە توندی لە بەرپەرچدانەوە بکات بەرامبەر بە پێچەوانەکاران و بەرهەڵستکاران ئەوا پێشەوا ئەلبانی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ بەحزبیەکی ئیخوانی یان لەسەر پەیڕەوی ئیخوانی دەزانێت ئەگەرچی لە حزبەکەشیاندا نەبێت ، هەروەك لەم ووتەیەیدا بە ڕاشکاوی و بە ڕوونی دەردەکەوێت :

**پێشەوا ئەلبانی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە ووتویژێکیدا سەبارەت بە کەسێك کە ڕەد و بەرپەرچدانەوەکانی بۆ ( البوطي ) بە توند و تیژ دەزانێت ، دەفەرموێت :**

(( ردّنا نقول لهذا الأخ المجهول عندي ... ، لا أعرف هذا الإنسان هل هو عرف البوطي ؟! هل عرف موقفه من الدّعوة ـ دعوة الحقّ ـ ؟! يقينا لـم يعرف !!!

هو مثله مثل إنسان ضرب شخصا كفّا فأوجعه وهناك رجل ثالث قال آذاه وهو محقّ في قوله آذاه ، لماذا ؟ لأنّه رأى ضاربا ... ورأى مضروبا ، لكن هذا الرّائي الثّالث لو علم أنّ المضروب بكفّ واحد كان ضرب صاحب الضّرب بكفّ واحد ضربات كثيرة هل يقول هذا معتدي ؟! هل يقول هذا متشدّد ؟! ما يقول إن شاء اللّه .

ما يقول هذا الإنسان حينما يعرف حقيقة البوطي ، **لكن أظنّ هذا الإنسان اللّه أعلم : هو من جماعة الإخوان المسلمين حزبيّا ... ، أقول إمّا : هو من جماعة الإخوان المسلمين حزبيّا ، أو : على منهجهم فكريّا لابدّ من واحدة منهما ... ، لا يمكن إلاّ واحدة من الاثنتين ....**

يا أخي لكن هو إمّا أن يعرف البوطي أو يـجهله ، فإن كان يـجهله فسبق الـجواب ، ... **وإن كان يعرفه فهو أحد الرّجليـن إمّا إخونجي ... إمّا إنّه حزبـي أو علـى منهج الـحزبيّيـن ....**

**هؤلاء سياستهم تجميع النّاس وتكتيلهم ورضى عن السّلفي وعن الخلفي وعن الحزبي وعن الشّيعي و و إلى آخره فهذه دعوتهم فهم ينكرون استعمال الشّدّة مطلقا وهذا ليس إسلاما انكار استعمال الشّدّة مطلقا ليس إسلاما ما رأيك ؟**

**... طيّب أنا الآن أسمعك حديثا انقله لصاحبك هذا قال ـ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ ـ :**

... " من تعزّى بعزاء الجاهليّة فأعضّوه بهن أبيه " هذه شدّة بلا شكّ في منتهى الشّدّة ، من تعزّى بعزى الجاهليّة فأعضّوه بهن أبيه .

لكن هـذا الَّـذي استعمل هـذه الشِّدَّة هو الَّذي خوطب بقوله ـ تعالى ـ : ﴿ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ﴾ ( آل عمران : ١٥٩ ) .

وهـو الَّـذي قيـل لــه : ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ ( القلم : ٤ ) .

فصاحب هذا الخلق العظيم هو الّذي قال هذه العبارة الّتي يستنكرها أمثال هذا الأخ الّذي يقول أنا استعملت الشّدّة على البوطي هو لا يعرف البوطي وهذا أحسن الظّنّ فيه ، وإن كان يعرفه ، فإذن ورد الاحتمال الثّاني ... )) [١] .



[١] ( تفريغات أشرطة العلامة محمد ناصر الدين الألباني : ١٣ / ٣٢٠ ـ ٣٢٢ ، سؤال : ما رأيكم فيمن يقول إن ردكم على رمضان البوطي كانت فيه شدة زائدة ؟ ) .

❑ شیوەنی دایک عەبباس بۆئەمیە ، ومەربەتی فەرەس لێرەیە :

( چالاک حسن ) سەردەمانێکە بۆ دلّڕاگرتنی ـ حزبی و گومڕایان ـ شەلـم کوێرم ناپارێزم کەوتووەتە ناو بنەوا سەلەفیەکان ، و تەئصیلات و بانگەشە دەکات بۆ ڕازیکردنی دلّیان بەهەر شێوەیەك بێت !!! وە لەو کارەشیدا گوێی لە فەوتانی سەلەفیەکان نیە ـ کە جەنابی ناوی توندڕە و موتەتەڕیفیان لێدەنێت !!!! ، و دواتریش : بە مەدخەلیەت !!! ـ جا ئەو لەناوچووانە پەنجا بن یان سەد موتەتەڕیف ـ وەکو خۆی دەیلّێت ـ بەس ئەوەی مەبەستە کە سەر ئەو سفرە تەمییعی و شلڕەوییانەی کە جەنابی ڕایخستووە پڕبێتەوە و هەموو ڕەنگ و هەموو تامێکی لەسەر بێت ، بەبێ هیچ جیاوازی و بەربەست و لەمپەرێك لە پێشیاندا !!!!

بۆیە لێرەش ـ تۆزێك بەشەرمەوە و بێ زۆر ڕاشکاوی ـ ئاماژە بە هۆکاری شیوەنەکەی دەکات و مەربەتی فەرەس دیاری دەکات ، ئەویش لەوەی کە دەلّێت :

(( ئەوەتا ئەبینین زۆرجار خەلّکانێك هەن ڕازین بە مەنهەجی صەحیح وشوێنکەوتنی پێشینی ئەم ئومەتە ، بەلاّم ڕازی نابن بەوەی ناوی سەلەفیەت لە خۆیان بنەن و زۆر جار گلەیی زۆریان هەیە و ڕەنگە بکەونە هەلّەیشەوە بەو هۆیەوە ، بەلاّم بەناونانی ئەو ڕەوتە وناسینیان ئەوا ئەو توندی و سلبیاتەی هەیانە لەسەر خۆیان ئەکەوێت ، نەك لەسەر کۆی مەنهەجەکە )) [١] !!!

بەلاّم خۆزگە ئەوەندە شەرمن نەبوایە و تۆزێك زیاتر بۆ هەوادارانی ناوی هەندێك لەو خەلّکانەی بووتایە ، جا کەلاری بن !!! یان گەرمیانی !!! یان سەیدصادقی !!! جا ئەوانەی کە سەلەفین و لە ناو حیزب و گروپ و کۆمەلە ئیسلامیەکانن !!! یان ئەو ئیخوانیانەی کە بە فیرقەی ناجیە و تائیفەی مەنسورەیان دەزانێت !!!!

---

[١] شێخێکی سەر فەیسبوکی هاوپەیڕەوی (چالاک حسن) بە سەلەفیەکان دەلّێت :

(( پانزە سالّە بەکتێب و بەدەم و بەقسە ئەم فیرقە کەوتونەتە گیانی هەرچی موسولّمانە وتەنها ئەوەی لەبالّی ناو فیرقەکەیان نەبێ بەگومڕای ئەزانن )) !!!

❑ كاكە مەلا : ماوتە كاولی بكەی ؟!!!

(چالاك حسن) دەڵێت : (( تەبعەن بێ ئەوەی ئێمەیش بكەوینە هەمان هەڵەی ئەو برایانەوە ، بەوەی حوكمی قورسیان بەسەردا بدەین ، چونكە ئەوان برای ئێمەن ولە بازنەی ئەهلی سونەتدان و نابێت ستەمیان لێبكرێت لە حوكم دانداو گلەیی ورەخنە ڕاستەكانیان وەرنەگیرێت . )) !!!!

**یەكەم** : ناو و ناتۆرەنانەكەت خـۆی بۆ خـۆی ستەمە هەم لە سەلەفیەكان و هەم لە ( ربيع بن هادي المدخلي ) .حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى. !!!

**دووەم** : كردنەوەی دەرگات بۆ توانج و تانەدان لە سەلەفیەكان و سەلەفیەت و بنەواكان و زانایانی !!!

**سێیەم** : بێدەنگ بوونت لە زۆرێك لە تانە و تەبدیعكردنی سەلەفیەكان !!! ئایا ئەمە بەستەم نازانیت ؟!!!

خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴾ ( النحل : ٢٥ ) .

پاشان كە برایەك شتێكت لەبەرامبەردا دەڵێت ، جەنابت دەڵێیت :

(( دەی بۆ ئەبێت دوای ئەم هەموو وەصف وسەنایە ، برای وا هەیە واتێبگەیێت من لە شأنی شیخ ربیعم كەمكردۆتەوە ؟!! ئایە ئەو برایانە هەر نایانەوێی باسی هەڵە و كەموكورتێكانی ئەو شێخە بكرێت ؟!! )) !!!

كە ئەمەش ئەگەر بەڵگە بێت لەسەر شتێك ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە :

١ ـ جەنابت وا دەزانیت سەلەفیەكان ئەوەندە كەودەنن بەهەندێك قسەی هەنگوێنی ـ ژەهراوی كراو ـ دەرگاكانی دڵیان بۆ جەنابت دەكەنەوە و هەموو بەیەك دەنگ دەڵێن :

(( قُلْتَ وَصَدَقْتَ و وَفَّيْتَ ، سَمِعْنَاْ وَأَطَعْنَاْ )) !!!!

٢ ـ یان ئەوەیە کە جەنابت تا ئێستاش هەر لەواتای :

کەمکردنەوەی شەئنی زانایان تێنەگەشتوویت !!!

وە نازانیت واتای هەڵە چیە !!!

وە نەش سنوری حوکمی قورس دەزانی بۆ ئەوەی بەسەر خەڵکدا نەیدەیت !!!

دەسا جەنابت باش بزانە ـ ئەگەر نازانیت ـ سەرتاپای پۆستەکەت و هەندێك لە کۆمێنتەکانیشت ستەمن لە بەرامبەرەکەتی دەکەیت !!!

وە هەر ناشزانیت : ـ ئەگەر هەبێت ـ (( هەڵە و کەموکورتێکانی ئەو شێخە !!! )) چین ؟! و کەی ؟! و لەکوێ ؟! و کێ دەبێت هەستێت بە چاکرکدنەوەیان ؟!!

بۆیە بەڕاستی بێ هیچ پێچ و پەنایەك ئەم پۆستەی جەنابت و هاوشێوەکانی دە ئەوەندەی تر بارودۆخەکەی شڵەژاندووە و ئاشوب و فیتنەکەی گەورەتر کردووەتەوە !!!

دەشزانی لەبەرچی ؟!!! لەبەر ئەوەیە کە جەنابت کەسی شیاو نیەت لەم بووارەدا ، و بوارەکە بواری جەنابت نیە ، بەڵکو تۆ خۆتت تێ هەڵقورتاندووە !!!!

بەڵام لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دواییە ، و دەبێت هەموو عوجر و بوجر و جڕ و جانەوەر و ڕوەیبیزەیەك بێنەگۆ و لەکاری گشتی موسڵمانناندا بدوێن !!! ، و شێوێکی تێبدەن !! ئەسپی نەزانی خۆیانی تێدا تاوبدەن !!!!

پێشینان فەرموویانە : نانی زۆر کەیبانو ، یان بێ خوێ ، یان شۆر دەبێت !!!

وە فەرموویانە : بەردێك نەزانو کاڵفامێك بیخاتە گۆمێکەوە ، بەسەدان مەلەوانی ژیر و زانا دەرناهێنرێت !!!

باشە تۆ تا ئێستا نازانیت کە هەڵەی زانایان ـ ئەگەر هەبێت ـ لە نێو خەڵکانی نەشارەزا و بێ ئیلتیزام و نەیاراندا باس ناکرێت ، ئەگەر مەبەست لە باسکردنیشی هەوڵی چاکسازیش بێت ؟!!!

ئەوەتا جەنابت بەیەکێك لەکۆمێنت نوسەکانی سەر پۆستەکەت دەڵێیت :

(( ... **شەرمەزارمان مەکە لە پێش چاو خەڵکانێك کە ڕەنگە ئیلتزاماتی دینیان نەبێت ، وموتابەعەی ئەم نوسینە بکەن** ، و وابزانن موسڵمانان ئەمەیە ئوسلوبیان کە بەیەك بڵێن ... )) ؟!!!!

بەڵام سەرباری ئەوەش هەر هاتویت تانە و توانج لە زانایان دەدەیت !!!

پێشەوا ( محمد بن صالح العثيمين ) ـ رحمه الله تعالى ـ سەبارەت بەم کارەی جەنابت وئاژاوەگێڕەکانی سەر تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان فەرموویەتی :

(( بعض الناس إذا زل بعض العلماء مثلا ، ووقعوا في أخطاء ، أخذ هؤلاء يكتبون في المجلات والصحف أخطاءهم ؛ بحجة أنهم يبينون الحق ، وهذا من الغلط ، والحقيقة أن هذا الفعل فيه مضرة من ثلاثة وجوه :

**الوجه الأول** : أنها مضرة على الكاتب ؛ لأن الذين يثقون بالشخص الآخر يرون أن هذا مخطئ ، ويقل وزنه عندهم .

**الوجه الثاني** : أن فيه أيضاً إضعافاً للثاني ـ المردود عليه ـ ، ومعلوم أنه إذا ضعفت منازل العلماء في الأمة ضاعت الأمة ؛ لأن العلماء هم القادة ، فإذا ضعفت منازلهم عند العامة ضاعوا وصاروا كالإبل التي ليس لها راعٍ ، أو كالغنم التي ليس لها راعٍ .

**الوجه الثالث** : أن فيها إضعافا للشرع ؛ لأن العالم الذي رد أو المردود عليه إذا قال قولاً غير هذه المسألة شك الناس فيه وقالوا : لعل هذه من خطأ فلان ؛ فصار فيه مضرة من ثلاثة وجوه .

والواجب على العلماء فيما بينهم إذا أخطأ أحدهم أن يتصلوا به فيناقشوه ، فإن كان الصواب معه تبعوه ، وإن كان الصواب معهم يتبعهم ، ثم لو فرض أنه أصر على

ما هو عليه وله وجه ـ لأن المسألة مسألة اجتهاد ـ فلا أرى أن يرد عليه أبداً ؛ لأن الرد والأخذ والمناقشة في مسائل الاجتهاد بين العامة ـ لا شك ـ أنه ضرر ، خصوصا في هذا الوقت ، حيث يوجد أناس يدعون إلى التقليل من شأن العلماء ، والكلام فيهم في المجالس ؛ لأنهم فقدوا الزعامة التي يريدونها فصاروا مثل الزعماء الآخرين الذين عارضوا دعوة الرسول عليه الصلاة والسلام لما فقدوا الزعامة التي يريدونها ، ليس لهم سبيل إلى ما يريدون إلا أن يضعفوا الجانب الآخر .

وهذا على خطر عظيم جداً .

فأنا أرى أنه إذا وجد خطأ من أي عالـم ـ والإنسان غير معصوم ، فقد يخطئ ولا يتبين له خطأ إلا بالمناقشة ـ أن يتصل به ويبحث معه ، فإن تبين الحق وجب على من تبين له الحق أن يتبعه ، وإن لـم يتبين وصارت المسألة فيها مساغ للاجتهاد فالواجب عدم الرد عليه )) [١] .

هەر لەم بارەیەوە پێشەوا ( صالح الفوزان ) ـحَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی :

(( نعم أنا لا أقول إن العلماء معصومون وأنهم لا يخطئون ؛ العصمة لكتاب اللّـه وسنة رسوله ﷺ ؛ والعلماء يخطئون ولكن ليس العلاج أننا نشهر بهم وأننا نتخذهم أغراضاً في المجالس ؛ أو ربما على بعض المنابر أو بعض الدروس لا يجوز هذا أبداً ؛ حتى لو حصلت من عالم زلة أو خطأ فإنَّ العلاج يكون بغير هذه الطريقة .

قال ـ تعالى ـ : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا

---

[١] ( تفسير سورة آل عمرن : ج ٢ ، ص ٣٧٤ ـ ٣٧٥ ) .

وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ ( النور : ١٩ ) .

نسأل اللّه العافية والسلامة ، فالواجب أن نتنبه لهذا الأمر ، وأن يحترم بعضنا بعضاً لا سيما العلماء ، فإنَّ العلماء ورثة الأنبياء ولو كان فيهم ما فيم )) [١] .

بۆیە باش بزانە (کاکە مەلا) ئەم پۆستە و زۆرێك لە کۆمێنتەکانی جەنابت :

هەمان ئەو هەڵانەیە کە بەپێوەر و پەیڕەوی پووچی خۆت وێنایان دەکەیت و دەیاندەیتە پاڵ کەسانێك و بەڕەوتیان لەقەڵەم دەدەیت !!! لە توندڕەوێتی !!! و حوکمی قورسدان بەسەر خەڵك !!! و ... هتد .

بەڵکو : ئێوە ـ واتە : خۆت و هاوبیرانی ئاماژە بۆ کراوت ـ تەنانەت دەستان لە بنەوا سەلەفیەکان و زانایانیشی نەپاراستوە !!! ، تاکو کار گەشتۆتە ئەوەی لە بازنەی ئەهلی سوننەدا بیانکەنە دەرەوە ... ئەگەر نەڵێم : لەبازنەی ئیسلامەتیش !!! جا ئەو کردنەدەرەوە بە ناڕاستەوخۆ بێت ، یان بە ئیقرارکردن بێت بۆ ووتەکانیان !!!



[١] ( محاضرات في العقيدة والدعوة : ج ٢ ، ص ١٨٤ ) .

❑ دوو بەڵگەی زۆر بەهێز . لە دید و بۆچوونی ( چالاك حسن ) . بۆ حەڵاڵکردنی ناو و ناتۆرەنانی (مەدخەلیەت !) بەسەلەفیەکانەوە :

خوای پەروەردگار سەبارەت بە نەوەکانی ئیسرائیل دەفەرموێت : ﴿ يَابَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُوا بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ * وَآمِنُوا بِمَا أَنْزَلْتُ مُصَدِّقاً لِمَا مَعَكُمْ وَلاَ تَكُونُوا أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ وَلاَ تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ * وَلاَ تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ * وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ * أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ وَأَنْتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ ﴾ ( البقرة : ٤٠ ـ ٤٤ ) .

وە فەرموویەتی : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لاَ تَفْعَلُونَ * كَبُرَ مَقْتاً عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لاَ تَفْعَلُونَ ﴾ ( الصف : ٢ ـ ٣ ) .

وە پێشەوا شافعی ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە هونراوەیەکیدا فەرموویەتی :

لَا تَنْهَ عَنْ خُلُقٍ وَتَأْتِيَ مِثْلَهُ     عَارٌ عَلَيْكَ إِذَا فَعَلْتَ عَظِيمُ

**منیش دەڵێم** : لەوەش خراپتر ئەوەیە کە بەڵگەش بۆ خراپەکاریەکەت بهێنیتەوە ، و هەوڵی ئەوەش بدەیت کە بەدەلیلی عەقڵی ـ ئەگەرچی هەروەکو ( چالاك حسن ) دەڵێت : موخالەفەیەکی زەقی ئەو ئایەتەی خوای گەورەش بێت کە دەفەرموێت : ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ﴾ ، و لەکاتێکدا ئەو برایانەش کە ئەو ناوەیان لێدەنێت ڕازی نەبن ، و جگە لەوەش هۆکارێکە بۆ دڵ ڕەنجاندنیان ، و دروست بونی دوبەرەکی ـ کە دڵنیام جەنابت ئەوەت پێ خۆش نیە ـ کارەکەت بشەرعێنیت ، و پۆشاکی شەرعی لەبەر بکەیت !!!

( **چالاك حسن** ) سەرباری ئەوەی زۆرجار باس لە زەروورەتی بوونی بەڵگە دەکات بۆ هەموو کردار و گوفتارێك ، کەچی لێرەدا : وانابینم !!! بووەتە واقع !!! مادام !!! بەڵگەی

تری عەقڵی لاوازتر لە ماڵی جاڵجاڵۆکە دەهێنێتەوە بۆ ئەم تاوانەی ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ ( العنكبوت : ٤١ ) .

(**چالاک حسن**) دوو بەڵگەی زۆر بەهێز ـ بە دید و بۆچوونی خۆی ـ بۆ حەڵاڵکردنی ناو و ناتۆرەنانی ( مەدخەلیەت ! ) بەسەلەفیەکانەوە هێناوەتەوە ئەوانیش :

١ ـ **دەڵێت** : (( وایش نابینم ئەم ناولێنانەیان ـ کە بووەتە واقیع ـ کارێکی خراپ بێت ، مادام زوڵمیان لێنەکرێت وکو برایەکی ئەهلی سونە سەیرکرێن )) !!!

٢ ـ **دەڵێت** : (( ئاخر ئەو مەزهەبیانەی ناوی ڕیبەرەکانیان هەڵگرد ، وەکو حەنەفێکان وشافعی ومالکی وحەنبەلێکان ، هەندێك جار شوێنکەوتوانیان ئەوەندەی شوێنکەوتوانی ئەم زانایە تەعصوبیان بۆیان نەبوە و خۆیان مولزەم نەکردوە بە هەمو ئیجتهادەکانیانەوە .. )) !!!

منیش تەنها لە وڵامدا ئەم ووتەیەی خۆی بیردەخەمەوە و حوکمی کارەکەشی بۆ خوێنەرانی بەڕێز دەهێڵمەوە ، و دەڵێم :

(( ناو نانی ( مەدخەلیەکان ) یان هەر ناوێکی تر بەکۆمەڵێك برای زۆرەوە کە خۆیان ڕازی نەبن پێی ، جگە لەوە هۆکارێکە بۆ دڵ ڕەنجاندنیان ، و دروست بونی دوبەرەکی ـ کە دڵنیام تۆ ئەوەت پێ خۆش نیە ـ ، موخالەفەیەکی زەقی ئەو ئایەتەی خوای گەورەیە کە ئەفەرمیت : ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ﴾ ... ))

لە کۆتاییشدا ـ خۆی ووتەنی ـ ووتوویەتی : (( جا هیوام وایە تەسلیمی ئەمری خوا بیت بە دلیلی عەقڵی کار بە پێچەوانەی نەکەی ، ... )) !!!

❑ سیاسەتی میکافیلی : ( الْغَاْيَةُ تُبَرِّرُ الْوَسِيْلَةَ ) لە دروستێتی و نادروستێتی ناو و ناتۆرەنان بە بەرامبەرەوە لە کاروکردەوەی ( چالاک حسن ) !!!

بەداخەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا پیادەکردنی بنەوای میکافیلی : ( الْغَاْيَةُ تُبَرِّرُ الْوَسِيْلَةَ ) لە کار و کردەوەی زۆرێك لە خەڵك لە بوارە جیاجیانی ژیاندا دەبینرێت ، دەبینیت خەڵکانێك هەن بۆ گەشتن بە مەبەست و مەرامی گڵاویان هەر ڕێگەیەك هەبێت دەیگرنەبەر ، بەبێ گوێدانە حەڵاڵێتی یان حەرامێتی ئەو کارەیان !!!

یان دەبینیت بەهەمان ڕێگە و بە هەمان پیادەکردن بۆ بنەواکە : لە سەردەمێکی ژیانیان بۆ مەبەستێك شتێك قەدەغە دەکەن ، پاشان دەبینیت بۆ مەبەستێکی تر بەحەڵاڵی دەزانن ئەگەرچی شەریعەت و زانایانیش لە هەردوو باردا بە حەرامیان زانیبێت !!! تەنانەت ئەگەر ئەو شتەش پێچەوانەی دەقی ڕاشکاوی قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیحی پێغەمبەری خواش بێت ﷺ !!!!

تا کار گەشتووەتە ئەوەی کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کەسانێکی بەناو سەلەفی ـ بە بیانوگەلێك لە ماڵی جاڵجاڵۆکە لاوازتر !!!! ـ ئەم پەیڕەوە پیادە دەکەن لە بڵاوکردنەوەی چەواشەکاریەکانیان !!!

سوارچاکی پیادەکاری ئەمجارە ( چالاک حسن ) ـە لە پۆستە پڕ چەواشەکاریەکەی کە ناوی لێناوە : (( مەدخەلیەت ڕەوتێکی سونی سەلەفیە ، ... )) !!!

لە هەموو خراپتریش ئەوەیە کە ئەم سوارچاکە هەڵکەوتووەی گەلی کورد خۆی لێبووەتە موجتەهید و ئەو ئەحکامە شەرعیانە دەگۆڕێت کە دەقی ڕاشکاوی شەریعەتیان لەسەرە ، و پێشتر خۆی کردوویەتیە بەڵگە لەسەر خەڵکانی تر !!!! هەموو ئەو چەواشەکاریانەشی تەنها بەبەڵگی عەقڵی !!! کە پێشتر نکوڵی لێکردوون ـ هەروەك لە هەندێك ووتەیدا دەیخەینەڕوو ـ !!!

خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ

أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً ﴾ ( الإسراء : ٣٦ ) .

وە فەرموویەتی : ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَاناً وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ ﴾ ( الأعراف : ٣٣ ) .

( **چالاک حسن** ) لەم پۆستەیدا ناو وناتۆرەی ( مەدخەلیەت ) بە سەلەفیەکانەوە دەنێت ، هەروەك دەڵێت : (( مەدخەلیەت ڕەوتێکی سونی سەلەفیە ، ... )) !!!

منیش دەڵێم : سەرباری ئەوەی کە پرێشتر خرایەڕوو و باسکرا ، و تێیدا دەرکەوت کە زانایان پێچەوانەی ئەم ئیجتیهادەی ( **چالاک حسن** ) ـن ، و ئەو کارەیان بە چەندەها خراپەکاری وەسف کردووە ، بەڵام خۆ خودی ئەم موجتەهیدە خۆی پێشتر نکوڵی لێکردووە ـ بەهەر مەبەستێکەوە بێت ـ هەر وەکو مامۆستا ( **عثمان أحمد** ) ـی بەڕێز لە کۆمێنتەکەیدا بیری دەخاتەوە و دەفەرموێت : (( ... ، ئەو پۆستەی کاك چالاکم بینی زۆر سەیربوو بەلامەوە کە ئێستا اجتهادی کردووە ، و بۆی دەرکەوتووە کە ئیدی دەبێت ناوی مەدخەلییەکان لە سەلەفییەکان بنیت ، ئەوە وێنەی پۆستی ماوەیەك پێش ئێستا خۆتە ... !!! )) !!!

لە وێنەکەشدا هاتووە کە ( **چالاک حسن** ) بەکەسێك دەڵێت :

(( م . بەڕێز : ناو نانی ( مەدخەلـیکان ) یان هەر ناوێکی تر بەکۆمەڵێك برای زۆرەوە کە خۆیان ڕازی نەبن پێی ، جگە لەوە هۆکارێکە بۆ دڵ ڕەنجاندنیان ، و دروست بونی دوبەرەکی ـ کە دڵنیام تۆ ئەوەت پێ خۆش نیە ـ ، موخالەفەیەکی زەقی ئەو ئایەتەی خوای گەورەیە کە ئەفەرمیت : ﴿ ولا تنابزوا بالألقاب ﴾ ، جا هیوام وایە تەسلیمی ئەمری خوا بیت بە دلیلی عەقڵی کار بە پێچەوانەی نەکەی ، ... )) !!!

جا نازانم بۆ دەبێت کاکەی موجتەهید ( **مەلا چالاک حسن** ) سەرباری ئەوەی کە ئەم

ناونانە بە (( بەکۆمەڵێك برای زۆرەوە کە خۆیان ڕازی نەبن پێی )) !!!

کە : (( جگە لەوە هۆکارێکە بۆ دڵ ڕەنجاندنیان )) !!!

و (( دروست بونی دوبەرەکی )) !!! ـ کە دڵنیام خۆشی ئەوەی پێ خۆش نیە ـ !!!

و (( موخالەفەیەکی زەقی ئەو ئایەتەی خوای گەورەیە کە ئەفەرمیت : ﴿ ولا تنابزوا بالألقاب ﴾ ، ... )) !!!

بەهەندێك برِ و بیانووی عەقڵی پوچەڵ دروست بێت و بە ئیجتیهادێکی دروست بزانرێت ؟!!!!

ئاخۆ دەبێت کێ لە زانایانی سەلەفی پێشینی ئەم کاکە موجتەهیدە بن ؟!!!

یان ئەوەی کە بیانووەکە ئەوەیە کە : (( خۆ ناونانی ئەو برایانە بە مەدخەلێکان ، هەر هەیە و من دام نەهێناوە ، ... )) !!!

عەرەب دەڵێت (( الْعُذْرُ أَقْبَحُ مِنَ الْفِعْلِ )) !!!

پێشینەی کورد ووتوویانە : (( بیانوی ..... نانی جۆیە )) !!!!

ئاخۆ ( *چالاك حسن* ) تۆ نازانیت ئەمەی کە هەر هەیە لە داهێنراوی هەردوو تاقمی گومڕایی ( *تەکفیری وئیخوانیەکان* )ـە ؟!!!

یان هەروەکو لە ناونیشانەکەدا ووتوومە : (( سیاسەتی میکافیلی : ( الْغَايَةُ تُبَرِّرُ الْوَسِيْلَةَ ) لە دروستێتی و نادروستێتی ناو و ناتۆرەنان بە بەرامبەرەوە ... !!! )) ؟!!!!

باشە خۆ جەنابت دەڵێت : (( بەڵێ من دژ بەو ناونانە بوم ، چونکە نا شەرعیە )) !!! ئاخۆ ئێستا چی وای لێکرد بشەرعێنرێت ؟!!! تۆ بڵێی سروش و وەحی هاتبێتە خوارەوە ؟!!!

دەڵێم : لەوانەیە وابێت سروش و وەحی هاتبێتە خوارەوە ، بەڵام ئەم جارەیان ، لەم

شێوەیە کە خوای پەروەردگار سەبارەتی فەرمووپەتی : ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَنْ تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ * تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ * يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ ﴾ ( الشعراء : ٢٢١ ـ ٢٢٣ ) !!!

وە هەر لەم بارەیەوە خوای پەروەردگار فەرمووپەتی : ﴿ شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ * وَلِتَصْغَى إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُمْ مُقْتَرِفُونَ * أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِنْ رَبِّكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ * وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ * وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ * إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَنْ يَضِلُّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾ ( الأنعام : ١١٢ ـ ١١٧ ) !!!

یان وا دیارە بیانووی کاکە ( **چالاک حسن** ) ئەوەیە کە خەڵکێك هەندێك ناو و ناتۆرەیان بۆ خەڵکانێکی لاڕێ و گومڕا داناوە ، ئەویش لە کاردانەوەی ئەوان ئەم ناو وناتۆرەیەی ناوە بە سەلەفیەکانەوە ، هەروەك جەنابیان دەڵێن : (( بەڵێ من دژ ناولێنانی موسڵمانان بوم و ناووناتۆرە بۆ دروستکردنیان ، بەڵام ئەوە کێ بوو وەکو ڕاجیمە موسڵمانانی دائەگردەوە بەناو و ناتۆرە ؟!

حەلەبی و مەئربی وموەمەیع و شلڕەوو چی وچی ؟!! )) !!!!

یان بەڵگە زۆر بەهێزەکەت ـ لە لای خۆتدا ـ ئەوەیە کە (( ... ، وەك چۆن شافعی ومالکی وحەنبەلی هەبوە و کەسیشیان لە دائیرەی ئەهلی سونە دەرنەکراون ، ئەوا ئەکرێت مەدخەلیەتیش هەبێت وزوڵمیان لێ نەکرێت و بە کۆمەڵێکی سەلەفیش بناسرێن ، بەڵام خۆیان مەسئول بن لەو ئیجتهادە توندانەی کە هەیانە و سەلەفیەت

مەسئول نەبێت لەو ئیجتهادانە ... )) !!!

بێگومان ئەمە بەڵگە هێنانەوەیە : ناحالیبوون و پێوانەکردنی کەشکە لەسەر مەشك ، *بۆیە لە وڵامی جەنابتدا دەڵێم* :

*یەکەم* : خودی ئەو پێشەوایانەی کە ناوت هێناوون ڕازی نەبوون بەم ناو لێنانە ، بەڵکو خەڵکانێك بەهەڵگرانی بۆچوونە فیقهی و ئیجتیهاداتەکانی ئەوانەیان ناوە .

*دووەم* : ئەو ناو نانە بۆ دژایەتیکردن و کەمکردنەوە نەبووە لە پێگە و ڕێزی ئەو پێشەوایانە ، بە پێچەوانەی کاری بیدعەکاران لە ناو و ناتۆرەنانیان لە ئەهلی سوننە ، و ئەمەش کە لە ئەمرۆدا دەگوزەرێت ، لە ناونان بە سەلەفیەکانەوە بە : وەهابی و جامی و لا جەماعە و مەدخەلی ... هتد ، کە بۆ ناشرینکردنی پەیڕەوکارانی سەلەفیەتە ـ لە زانایان و شوێنکەوتوانیان ـ !!!

*سێیەم* : ئەوەی تۆ هێناوتەتەوە بۆ دروستێتی کارە ناشەرعیەکەی خۆت ـ هەروەکو خۆت پێشتر دەتووت ـ !!! هیچ لە زانایانی پاش ئەو پێشەوایان بە نادروستیان نەزانیوە ، و نکوڵیان لێنەکردووە ، وەك ئەوەی کە نکوڵییان لە کاری بیدعەکاران کردووە ، بە پێچەوانەی ئەمەی جەنابت ، و هاوبیرانت : زانایان نکوڵیان لێکردووە و لێیدەکەن ، و بە ناو وناتۆرەی ناشەرعی باسی لێوەکردووە ، هەروەکو پێشتر لە پرس و باسەکاندا خرایەڕوو و ئاشکرا کرا لەم نووسینەدا .

کەچی سەرباری هەموو ئەمانەش دێت و بۆ ڕەتکردنەوەی بیرخستنەوەکەی ( **مامۆستا عثمان أحمد** ) بۆ جەنابتان ، لازمێك بۆ ووتەکەی دەدۆزیتەوە و هەروەك بڵێی بەڕێزیان مەبەستی لە ووتەکەی ئەمە بێت کە جەنابت دەیڵێت ـ بێگومانیشم کە بەڕێزیان مەبەستی ئەوەیان نیە ـ !!! ، هەموو ئەمەش لەو ووتەیەت کە دەڵێیت :

(( **مامۆستا عثماني بەرێز** : ... یەعنی بەم تێگەیشتنەی جەنابت بێت بۆ ئەم ئەسەرە

، ئەوا ئێمە نابێت موراجەعەی بیر و بۆچونەكانمان بكەین ، و بژاری كەین و هەڵە و خراپەكانی دەركەین ؟! ... )) !!!!

بۆیە لە كۆتایی ئەم بەشەدا دەڵێم :

جەنبتان بە پێی مەبەست و ئیجتیهادەكانی خۆت ئەحكامە شەرعیەكان دەگۆڕیت ، و شەلم كویرم ناپارێزم كەوتوویتە ناو ئەحكامە شەرعیەكان ، و حەرامێك كە خوای پەروەردگار و پێغەمبەركەی حەرامیان كردووە و زانایانیش بەحەرامیان زانیوە جەنابت دێت و بۆ ڕەواجدان بە هەڵە و چەواشەكاریەكانی خۆت حەلاڵیان دەكەیت !!!!

بەڕاستی پێشینان جوانیان فەرمووە :

(( مَنْ دَخَلَ فِي غَيْرِ فَنِّهِ أَتَى بِالْعَجَائِبِ )) !!!!

خوای پەروەردگار كە لەهەمووان زاناترە ، و هەر ئەویشە هیدایەت دەر بۆ ڕاستیەكان ، و ڕێگای ڕاست ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ وَأَنْزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللَّهُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾ ( البقرة : ٢١٣ ) .

وە پێغەمبەری خواش دەفەرموێت : « اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرَائِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ؛ اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ ، إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ » ( رواه مسلم ) .

❑ هەندێك ووتەی دادپەروەرانە لەلایەن ئەوانەی کە کۆمێنتیان لەسەر پۆستەکەی چالاك حسن نوسیوە :

لەم بەشەدا هەندێك لە کۆمێنتەکانی ئەو کەسانە دەخەمەڕوو کە بەرامبەر بە پۆستەکە نووسراون و هەڵسەنگاندیان بۆی کردووە ، و دادپەروەری و هەق بێژیان تێدا دەبینرێت ، و دەردەکەوێت ،لەوانەش :

**یەکەم** : (( ... ئەم تەرزە لە نوسیندا حزبی وتەنی مەتاتییە ... ، چونکە ئێستا بڵێم : سنووری ئەم [ مەدخەلییەتە ] چییە ؟ کێن ؟ چۆن دەیانناسیتەوە ؟

دڵنییانیم وەڵامتان هەبێ .

دەستخۆشی حزبییەکانیش هەرگیز لە تەوازنمان لاسەنگ نەکات ... ، چونکە دەرنەتیجە ئەوان هەر سەلەفی بە عنوانی سڕ و بڕ و قڕ دەبینن .. !

بەهەندێ هوتافاتیش ، بەداخەوە گەلێك مەلا و بانگخوازی سەلەفییان توشی شەرم لەحەق و لەرزۆك لە ڕێبازدا کرد .. ئەمەش معلومە لای بەڕێزت نەخۆشینە ... )) .

**دووەم** : (( ... ئیمامی شافعی فەرمویەتی : بۆ ناسینی ئەهلی حەق شوێن تیری دوژمنان بکەون ، چوون بۆ کوێ حەق لەوێیە ؟!!! )) .

**منیش دەڵێم** : بێگومان ئەم پۆستەی ( **چالاك حسن** ) نموونەی زیندوی پشت ڕاستکەرەوەی ئەم ووتەیەی پێشەوا شافعیە .

**سێیەم** : (( ... کاك ( **چالاك** ) دەرگایەکی خراپت کردۆتەوە ، سەر بۆ شتی تریش دەکێشێت !! هیوادارم بە دەستخۆشی و ئەم شتانە تێنەکەویت ...

ئەوەی کە دوێنێ تەکفیری و حیزبیەکان دەیاندایە پاڵمان ئێستا خۆمان بۆیان ڕاست دەکەینەوە ... )) !!!

**چوارەم** : (( ... كاك ( **چالاك** ) ... مەدخەلی بوون تۆمەتێكە دەرێتە پاڵ ئەهلی سوننە ، هەمووشمان دەزانین سەرچاوەكەی لە كوێوۆیە ... .

ئێستا ( **دكتۆر چالاك** !!! ) پێمان بڵێ : مەدخەلی ئەمەش سەیرە !!! )) .

**پێنجەم** : (( ... لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆت ، بەڵام بابەتەكەت هەڵەیە ، چونكە : ﴿ **وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ** ... ﴾ )) دەیگرێتەوە .

**شەشەم** : (( ... ( **دكتۆر چالاك** ) شێخ ڕەبیع ئەوەندە بەڕەحمە دایم ئاخركەس قسە لەسەر موخالفین دەكات پۆستەكەی تۆ زوڵمی تێدایە ...

دەلیت : توندە ! واللە قسەكردن بە شێخ ڕەبیع و ئەو زاناكانی تر نیشانەی حزبیەكانە یان موبتەدیعەكانە ...

بۆیە من تۆ بەكەسیكی عەوام دەزانم ، خوای گەورە هیدایەتت بدات )) .

**حەوتەم** : (( ... بەردەوامبە لە ڕازیكردنی حزبیەكان ، و گشت تاقمە گومڕاكان لە خۆت . هەروەك بە لایك و كۆمێنتەكان دیارە ... )) .



پەیامێک بۆ

ئەوانەی کە دژایەتی خەڵکی مەدینە دەکەن

بەتایبەتی زانایانی سەلەفی ئەم شارە !!!

## پەیامێك بۆ
## ئەوانەی كە دژایەتی خەڵكی مەدینە دەكەن
## بەتایبەتی زانایانی سەلەفی ئەم شارە[1] !!!

پێشەوا ( البخاري ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە صەحیحەكەیدا ، و لە پرس و باسی ( إِثْمِ مَنْ كَادَ أَهْلَ الْـمَدِينَةِ ) ــدا فەموودەیەكمان لە ( عَائِشَةَ بنت سعد بن أبي وقاص ) ــەوە ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا ـ بۆ دەگێڕێتەوە ، كە فەرموویەتی : سَمِعْتُ سَعْداً ـ تعني أباها ﷺ قَالَ : سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ : " لاَ يَكِيدُ أَهْلَ الْـمَدِينَةِ أَحَدٌ إِلاَّ انْمَاعَ كَمَا يَنْمَاعُ الْـمِلْحُ فِي الْـمَاءِ " ( برقم : ١٧٧ ) ، واتە : هیچ كەسێك نیە كە كەید و دژایەتی لە بەرامبەر خەڵكی مەدینە بكات ، ئیللا دەتوێتەوە هەروەكو چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە .

بەڵام ڕیوایەتەكەی پێشەوا ( مسلم ) لە ( عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِى وَقَّاص ) ــەوە لە باوكیەوەیە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕێتەوە لەگەڵ زیادەی : " وَلاَ يُرِيدُ أَحَدٌ أَهْلَ الْـمَدِينَةِ بِسُوءٍ إِلاَّ أَذَابَهُ اللَّـهُ فِى النَّارِ ذَوْبَ الرَّصَاصِ أَوْ ذَوْبَ الْـمِلْحِ فِي الْـمَاءِ " ( برقم : ٤٦٠ ) ، واتە : هیچ كەسێك نیە كە خراپەی بۆ خەڵكی مەدینە بوێت ، ئیللا خوای پەروەردگار وەكو توانەوەی قورقوشم دەیتوێنێتەوە لە ئاگردا ، یان وەكو توانەوەی خوێ لە ئاودا .

( العيني ) لە لێكدانەوەی ئەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی :

(( بَيَانه : أَن الَّذِي يكيد أهل الْـمَدِينَة يذيبه اللَّـهُ ـ تَعَالَى ـ فِي النَّار ذوب الرصاصد ، وَلَا

---

[1] لە نووسینی : ( أبي فريحان جمال بن فريحان الحارثي مساء يوم الخميس ٢١ / شعبان / ١٤٣٥هـ ، المصدر : منتديات نور اليقين ) ــەوە وەرگیراوە بە هەندێك دەستكاریەوە .

يسْتَحق هَذَا ذَاك الْعَذَاب إلاَّ عَن ارتكابه إِثْماً عَظِيماً ، وَهَذَا مَأْخُوذ من حَدِيث مُسلم من طَرِيق عَامر بن سعد عَن أَبِيه فِي أَثْنَاء حَدِيث : " وَلَا يُرِيد أحد أهل الْمَدِينَة بِسوء إلاَّ أذابه اللَّه فِي النَّار ذوب الرصاص ، أَو ذوب الْملح فِي المَاء " )) [١] .

وە پێشەوا ( الحافظ ابن حجر ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( قَالَ عِيَاض : هَذِهِ الزِّيَادَة تَدْفَع إِشْكَال الْأَحَادِيث الْأُخَر ، وَتُوَضِّح أَنَّ هَذَا حُكْمه فِي الْآخِرَة .

وَيُحْتَمَل : أَنْ يَكُون الْمُرَاد مِنْ أَرَادَهَا فِي حَيَاة النَّبِيّ ﷺ بِسُوءٍ اِضْمَحَلَّ أَمْره كَمَا يَضْمَحِلّ الرَّصَاص فِي النَّار ، فَيَكُون فِي اللَّفْظ تَقْدِيم وَتَأْخِير ، وَيُؤَيِّدهُ قَوْله " أَوْ ذَوْب الْمِلْح فِي الْمَاء " .

وَيُحْتَمَل : أَنْ يَكُون الْمُرَاد لِمَنْ أَرَادَهَا فِي الدُّنْيَا بِسُوءٍ وَأَنَّهُ لَا يُمْهَل بَلْ يَذْهَب سُلْطَانه عَنْ قُرْب كَمَا وَقَعَ لِمُسْلِمِ بْنِ عُقْبَة وَغَيْره فَإِنَّهُ عُوجِلَ عَنْ قُرْب وَكَذَلِكَ الَّذِي أَرْسَلَهُ .

قَالَ وَيُحْتَمَل : أَنْ يَكُون الْمُرَاد مَنْ كَادَهَا اِغْتِيَالًا وَطَلَبًا لِغِرَّتِهَا فِي غَفْلَة فَلَا يَتِمّ لَهُ أَمْر ، بِخِلَافِ مَنْ أَتَى ذَلِكَ جِهَاراً كَمَا اِسْتَبَاحَهَا مُسْلِم بْن عُقْبَة وَغَيْره )) [٢] .

**دەسا ئەی موسڵمانی سوننی سەلەفی هەندێك وریاببەرەوە لە ترسناکی ئەو سزایەی کە لە فەرموودەکەدا باسکراوە ... و ڕابچەڵەکێ و لە خەوی غەفڵەت بێداربە ، و ئیتر نەکەی بەنوسین یان بەدەم ، یان بەهەر هۆکارێکی تر دژایەتی خەڵکی مەدینە بکەیت بەگشتی ، و ئەزیەت و ئازاریان بدەیت ، چونکە ئاکام و نەتیجەکەی ترسناکە خوا پەنامان بدات .**

**نەك هەر بۆ خۆت دووربکەویتەوە لەم تاوانە گەورەیە ، بەڵکو هەموو ئەوانەش ئاگادار**

---

[١] ( عمدة القاري شرح صحيح البخاري ، للعيني : ١٠ / ٢٤١ ) .

[٢] ( فتح الباري : ٤/ ٩٤ ) ، ( شرح مسلم للنووي : ٩/ ١٣٧ـ١٣ ) و ( شَرْحُ صَحِيح مُسْلِمِ لِلقَاضِي عِيَاض الْمُسَمَّى إِكمَالُ الْمُعْلِمِ بفَوَائِدِ مُسْلِم ، للنووي : ٤/ ٤٨٤ ) ، و ( الديباج على صحيح مسلم للنووي : ٣/ ٤٠٧ ) .

بکەرەوە کە دژایەتی خەڵکێکی سوننی سەلەفی دەکەن ـ لەسەروی هەمووشیانەوە ئەو زانا بەڕێزانەی ـ کە بانگەشەی بیروباوەڕی ڕاست و دروستی سەلەفیەت دەکەن ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی رضي الله عنهم لەسەر بوون ، لە مامەڵەکردن و هەڵس و کەوت لەگەڵ کاربەدەستان ، و دەرنەچوون لێیان ـ بەهێز و بەزمان ـ ، و پارێزگاری دەکەن لە سوننەتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ، و دژایەتی بیدعەکاران دەکەن ، و پەردە لەسەر گومڕاییەکانیان هەڵدەماڵن ، جا ئەشعەری و ماتوریدیەکان بن ، یان مورجیئە و خەواریج و ڕافیزەکان .

یان : گروپە لاڕێکانی ئەم سەردەمە بن لە ئیخوان و تەبلیغ و سروری و قوتبی و حەدادی و مومەییعە ، یان هەر چەشنێکی تری حیزبی و بیدعەکاری ... .

بۆیە ئەم فەرموودەیە و ئەو سزا گەورەیەی کە تێدا باسکراوە بیری خۆت و ئەوانەی بهێنەوە کە تا ئێستا دژایەتی خەڵکی مەدینە دەکەن ، بەتاییەت زانایانی بەڕێزی ئەم شارە .

وە بشزانن کە : ﴿أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ وَأَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ .

وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه أجمعين

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

## کۆتایی وئامۆژگاریەک :

**پاش شوکر و ستایشی خوای پەروەردگار و شوکرانەبژێری کردنی لەسەر تەواوبوونی ئەم نووسراوە ، لەم کۆتایی و ئامۆژگاریەدا دەڵێم : دەبێت موسڵمان بەگشتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ووتەی پێشەوایان و زانایندا بەم شێوەیە بێت کە بڵێن :**

**(( العلماء ليسوا معصومين ، قد يقولون الحق ، وقد يخطئون . من كان منهم مجتهدا فهو مصيب في صوابه ، وفي خطأه . ومن كان صاحب هوىً ، فهو مأخوذ عليه انحرافه ، وضلاله ، وبعده عن الحق .**

والعلماء لا شك أن اللَّه **ـ تبارك وتعالى ـ** جعل لهم منزلة عنده ، كما قال **ـ تبارك وتعالى ـ** : ﴿ **يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ** ﴾ .

ويقول **ـ تعالى ـ** : ﴿ **إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ** ﴾ ، حتى قال بعض العلماء : ( العلم : هو خشية اللَّه **ـ تبارك وتعالى ـ** ) .

فالذي يورثه العلم بكتاب اللَّه **ـ تبارك وتعالى ـ** وبسنة رسول اللَّه الخشية من اللَّه ، ومراقبة اللَّه **ـ تبارك وتعالى ـ** هذا هو العالم المعتبر به ـ والمعتد بأقواله ، مالم يخطئ ؛ فإنه ليس هناك عالم معصوم .

**ونحن اتجاه صوابه ـ القائم على الأدلة والبراهين ـ نكون معه .**

**وإذا أخطأ نعذره ، ولا نتابعه ، نُخطئ رأيه مع اعتقادنا أن له أجرا في هذا الخطأ** ، كما قال الرسول **ـ عليه الصلاة والسلام ـ** : « إِذَا اجْتَهَدَ الْحَاكِمُ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ اثْنَانِ ، وَإِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ وَاحِدٌ » .

**هكذا نزن أقوال العلماء بميزان اللَّه ـ تبارك وتعالى ـ :**

**إن كان حقا قبلناه ، وأيدناه ، ونصرناه ، وإن كان باطلا رددناه ، وإن كان خطأ عذرناه فيه ، وقلنا إنه مجتهد مخطئ ، ولا نقبل هذا الخطأ .**

نسأل اللَّه ـ **تبارك وتعالى** ـ أن يجعلنا وإياكم من الذين يستمعون القول ؛ فيتبعون أحسنه ، **وصلى اللَّه على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم** )) [1] .

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

---

[1] ( شبكة سحاب السلفية ، المنابر ، المنبر الإسلامي ، تفريغ صوتي للشخ ربيع بن هادي المدخلي ـ حَفِظَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ بعنوان : هكذا نزن أقوال العلماء ، للشيخ ربيع بن هادي المدخلي ، كتب بواسطة : مالك السلفي ) .

« ناوەڕۆک »

| بابەت و سەرباسەکان | پەڕە |
| --- | --- |

